## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ڕاستیەکانی ژیـــان

نووسینی: هێژا کاکەحەم کاوانی

بابەت: فەلسەفە

تایپ: هاوار کاکەحەم  کاوانی

پێداچوونەوەی دەق: ئاوات هاشم مزوری

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: 2014

تیراژ: **500** دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( )

ساڵی 2014ی پێ دراوە

# پێشەکی

بە ناوی خودای گەورە سوپاسی خوێنەر دەکەم وە ئەم کتێبە بە هاوکاری برادەری خۆشەویستەکانم و وە بنەماڵەی خۆم بە تایبەتی باوکی خۆشەویستم (کاکەحەم مصطفی)وە دوو کەسی زۆر ئازیزم کە زۆر بەرێزن لەلای من (لۆزان جیار أحمد) و (You Lan)زۆر هاوکاریان کردوم وە سوپاسی بنەماڵەی (دکتۆر محمد رازی) دەکەم کە پشتگیریەکی زۆریان بۆ کردوم لە هەموو لایەنێك سوپاسیان دەکەم بە تایبەتی بەڕێز (دکتۆر محمد رازی) دەکەم کە پاڵپشتم بوو لە هەموو بوارێك کە لە هەموو کاتێك زۆر سوپاسی دەکەم وە سوپاسی دادە (قمری رسول) دەکەم کە قسەکانی کاری گەر بون لەسارم... ڕاستی ژیان پێویستی بە ئەو کەسەیە کە بتوانێت کە لە ڕێگادا ڕۆیشت پێشی خۆی ببینێ و جۆرە کەسێك هەن نازانن ڕاستی ژیانیان چییە وە بۆ کوێ دەڕۆن بەس ژیانیان ڕۆژە و شتێکە بێ هۆ دەژی لە ژیان بەلاَم ژیان زۆر بە نرخە وە کاتیش بە نرخە چونکە ژیان لە کات دروست کراوە بۆیە هەردەم دەڵێم نرخی کات بزانە چونکە ژیان هەر دەقەیەك بوەتە بە یەك ساڵ، زۆربەی زۆری فەیلەسوفەکانی فەلسەفی دەڵێن ژیان زۆر بە نرخە ئەگەر بیزانی بەکاری بهێنی، هەمووکات فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ دەویت ژیان و مردن یەکسانە جارێك کەسێك پێی ووت ئەگەر یەکسانە بۆ خۆت ناکوژی؟ (ئەرستۆ) ووتی:— ووتومە مردن و

ژیان یەکسانە بەڵام ئەم ووتوە مردن خۆشترە لە ژیان، بۆیە دەبێت هەردەم بیر لە داهاتوو بکەینەوە وە بیر لە ئێستاش بکەینەوە.

ڕاستیەکانی ژیان پێویستی بەو کەسەیە کە یەکەم شت لەگەڵ خۆی ڕاستبێ وە هەر هەڵەیەکی کرد جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە چونکە ژیان پێویستی پێیانە تا ژیانێکی بە چێژ وەربگرن وە هەردەم خەڵك بە بینینیان هەست بە ژیانێك بکات و چاوەڕێی باشتر بکات لە ژیان، خەڵکی ئێمە بە دوای پارە ڕۆیشتوە بەڵام کەسیان بیر لە ڕۆژانی خۆیان ناکەن لەم سەردەمە ژیان بۆتە خەم و تێکچوونی ژیان بە هۆی پارە، پارە بۆ هەموو کات باش نییە ئەوانەی زۆر بە دوای پارە دەکەون هەموو شتێك دەکەن لە پێناو پارە ئەگەر کەسێك پارەی زۆری هەبوو ئەوا هاوڕێی بەرژەوەندی زۆرە بەڵام بۆ جارێك لێت قەوما هیچ هاوڕێت نامێنێ، ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ ڕۆژێك دێت ئەو کەسەی کە گیرفانی پڕ پارە بێ بە عیلم و بەناوبانگ دادەنێن ئەوەش مایەی شەرمەزارییە بۆ ئێمە کە واین، جاران هەژاری پیاوی دروست ئەکرد بە داخەوە ئێستا پارە ئەتکات بە پیاو!! ئەتکات بە هەموو شتێك !!!

ئای لەم ژیانە کەچی ئێستا وامان لێ هاتووە لە ژیان بدۆڕێین کەی ژیان وا دەبێت، منیش لەو سەردەمەدا هەر ڕۆ و سات و خولەلکێك خاوەنی بیرێك بووم هەر وەکو هەموو خەڵکی تر.

لەم سەرمەدا چ شتێك زۆر بە نرخە (جل و بەرگی جوان و پڕ لە زریق و باق، ئۆتۆمبێلی جوان، بردنەوە لەسەڕ و زۆرانبازی ........)، ئەو

هەموو شتانە بە پارە دەکرێ بۆیە هەردەم هەژارەکان بەس هیوای بۆ دەخوازن لەناو خەیاڵی خۆی دەیکڕێ لە خەیاڵیدا خۆی پێی ئاسوودە دەکات چونکە لە ژیانی ئەگەر ئەو پارەی هەبووایە دڵی نەدەهات پێی بدات چونکە ژیانی ئەو لە هەژاریدایە، لە هەژاریدا هەندێك ووشە دروست دەبێ وەکو (ناتوانم، پێم ناکرێ، ناتوانم باوەڕ بکەم) ئەی ژیان بۆ وای لێهات دونیا نەگۆڕاوە بەس مرۆڤەکان گۆڕاون، ئەو کاتە ڕەوشت و ئەدەب لە تۆدا بوونی ئەبێت هیچ کات هەقت بەسەر ژیان و کەسایەتی کەسەوە نەبێت..

**نەژی بۆ مـــردن بمرە بۆ ژیـــان**

**نووسەر**

2014/ /

**پیرمام**

# ڕاستیەکانی ژیـــان

## ژیان چییە:-

ئەگەر ژیانە بۆ دەمرین؟ ئەگەر مەرگە بۆ دەژین؟ ئەگەر خەندەیە بۆ دەگرین؟ ئەگەر گریانە بۆ پێ دەکەنین؟ ئەگەر عەشقە بۆ پێی ناگەین؟ ئەگەر عەشق نیە بۆ عاشق ئەبین؟ نەژی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان؟

## ١ - تۆ نیو مرۆڤ نیت ...
## تۆ مرۆڤیت ...

## * زۆر کاریگەرە ...!!!

تۆ نیو مرۆڤ نیت ...

تۆ مرۆڤیت ...

پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا مەگرە کە نیوە عاشقن، باوەڕ بەوانە مەکە کە نیوە هاوڕێن، خوێنەری ئەوانە مەبە کە نیوە داهێنەرن، نیو ژیان مەژی، نیو مردن مەمرە، نیو چارەسەر هەڵمەبژێرە، لە ناوەڕاستی حەقیقەتە، نیو خەون مەبینە، خۆت بە نیو هیوادە هەڵمەواسە، کە بێدەنگ بوویت، بێدەنگ بە تا کۆتایی، کە قسەت کرد، قسەکە تا کۆتایی، بێ دەنگ مەبە بۆ ئەوەی قسەکەت، قسە مەکە بۆ ئەوەی بێ دەنگ بیت، گەر ڕازی بوویت، هەموو ڕازی بوونەکەت پیشان بدە نەك نیوەی، گەر ڕازیش نەبوویت، ڕازی بوونەکەت بە تەواوی پیشان بدە چونکە نیو ڕازی بوون

ڕازی بوونە، نیو پەرداغ ئاو تینوێتیت ناشکێنێت و نیو ژەمیش تێرت ناکات، نیو ڕێگا ناتگەیەنێتە هیچ شوێنێك، نیو بیرۆکە هیچ هیچ ئەنجامێکت ناداتێ، نیو ساتی بێ تواناییتە و تۆش بێ توانا نیت، لەبەر ئەوەی تۆ نیو مرۆڤ نیت ... تۆ مرۆڤیت ... دەرفەتی ژیانێکی تەواوت هەیە، نەك نیو ژیان ...! لێرەدا دەتوانین خۆمان یەك لایی بکەین چونکە بۆمان دەر دەکەوێت کە ئێمە چۆنین ژیان ڕاستی هەردەم پێویستی مرۆڤێکی تەواوە نەك نیو مرۆڤ پێویست ئێستا خۆمان جیا بکەینەوە لە نیو مرۆڤی چونکە نیو مرۆڤ هیچت پێ نابەخشی ئەی مرۆڤ ژیان پێویستی بە مرۆڤێکی تەواوە چونکە دوو دڵی واتە نیو مرۆڤ ئەو شتە بێکەڵکە خۆتان با دوور بگرن ئەی مرۆڤ مرۆڤی ڕاستی هەردەم دەبێ یەك کەس بێ نەك هەموو کەسەکانی دەوروبەرت ئەی ژیان ئیتر وا لە مرۆڤەکان مەکە  کە ببنە  نیو مرۆڤ، ژیان تۆ بە هێزی کە تا بتوانێت بە خەڵکی بڵێن مرۆڤی ڕاستەقینە چییە،

مرۆڤەکان ئێوەش بە هێز بن تا بتوانن ژیانتان خۆشتر بکەن ژیانی ڕاستیمان دەوێ ئەی مرۆڤ کەسێك بە لە ژیانت کە خۆت دەتەوێ نەك ئەو کەسەیی کە خەڵك دەیانەوێ ژیان ئیتر بەسە ئازاری مرۆڤەکانمان مەدە چونکە مرۆڤەکان پێویستیان پێتە ئەی ژیان کرۆڤەکان ئێوەش وەڵامی ژیان بدەنەوە تا بزانێ ئێوە چەند بە توانان لە لە ژیان.

ژیانی ئێوە خۆشترە کە وەك ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، ژیان واتە ئازادی و مێهرەبانی و خۆبەخشین و هەست بە ئاسودە کردن، ئەی ژیان تۆش هاوکارمان بکە تا بتوانین سەر کەوین ژیان تۆ هێمن بە تا بتوانین کاری خۆمان بە یەکەوە ژیان پێویستی بە ئێمەیە هەروەها مرۆڤیش پێویستی بە ژیانە تا بتوانێت ئامانجەکانی بێنێتە دی. تۆ نیو مرۆڤ نیت ...

تۆ نیو مرۆڤ نیت.. مرۆڤەکان تەنها بەژداری خۆیان بڕیار بدەن نەك نیو بڕیار ئەگەر حەز دەکەی سەرکەوی دەبێ بە هەموو توانات کار بکەی نەك نیو توانات چونکە ئەگەر نیو توانای خۆت بەکار هێنا کەواتە تۆ سەرنەکەوتی ژیانی ڕاستی هەموو توانای دەوێت نەك نیو توانا، من ئەمەوێ وەك خۆم بیر بکەمەوە نەك وەك ئێوە، ئەگەر وەك ئێوە بیر بکەمەوە ئەی "من" کێم؟ مرۆڤەکان هەردەم دەبێت وەکو خۆیان بیر بکەنەوە نەك وەکو خەڵکانی تر وە دەڵێم بیریەکی مرۆڤێکی تەواو بکەن نەك نیو مرۆڤ مێشکی خۆتان بە باشی بکەنەکار نەك نیوەی مێشکتان بکەنەکار چونکە ئەگەر نیوەی مێشکتان بکەنەکار ئێوە هیچتان نەکرد مرۆڤی بە توانا وە مرۆڤێکی ڕاستی هەردەم هەموو شتەکانی خۆی بە تەواوی دەردەخات نەك نیو شتەکانی واتە نیوەی توانای خۆی دەرناکات بەڵکو هەموو توانای خۆی دەردەخات هەندێك لە توانای شتێك هەیە کە مرۆڤەکان لێی بە ئاگانین ئەویش ئەوەیە ئیشەکانی خۆیان یان کارەکانی خۆیان بە تەواوی نایکەن بۆیە هەردەم ئیشەکانیان دوا دەکەوێت هەردەم شکست دەخۆن تۆ مرۆڤێکی تەواو بە نەك نیو مرۆڤ کاریگەرە چونکە ناتوانین هیچ کارێکت بگەیتە ئەو شتەی کە دەتەوێ ئەمەش دەبێتە گەورەترین کێشەی مرۆڤی، مرۆڤەکان خۆتان بپارێزن لە نیو مرۆڤی هەردەم مرۆڤێکی تەواو و ڕاستی بن ئێوە دەتوانن هەموو بڕارێك بدەن بە مێشکێکی تەواو بە توانایەکی تەواو ئەمە دەبێتە مرۆڤێکی تەواو بە ڕاستی کاریگەرە نیو مرۆڤ بیت چونکە هەموو کێشەیەك لە نیوە دەست پێ دەکات وە ئەگەر تۆ هەموو شتێکت کرد ئەوە تۆ هیچ کێشەیەکت نامێنێ بەناوی نیو مرۆڤی، ژیانمان دەبێتە چەند بەشێك چونکە ئەگەر نیو مرۆڤ بین چونکە هەموو شتێك نیوە دەبێت واتە ژیانمان دەبێتە پارچە پارچە ئەو کات ژیانمان بوونی نامێنێ واتە ئەو کات دەبێتە ژیانێکی پارچە پارچە بە هۆی نیو مرۆڤیەوە وە بە هۆی نیو مێشکیەوە وە بە نیو توانابیەوە مرۆڤەکان بۆیە دەڵێم ئەگەر

هەر شتێکت کرد بە تەواوەتی بیکە یان سەر دەگری یان دەیبەیتەوە بەس ئەمە بزانە تۆ هەردەم بە ئەقڵێکی تواو بە توانای ئەم کارەت کردووە ئەمە زۆر گرینگە بۆ مرۆڤ، مرۆڤەکان ئەگەر هەر بڕیارەکتاندا بە تەواوەتی بیکەن نەك نیو بڕیار ئەگەر نییە بڕیاریتدا کەواتە لێشی پەشیمان دەبیتەوە لێی پەشیمان بویەوە کەواتە تۆ هیچت نەکرد بۆیە هەردەم مرۆڤ بە هەر شتێکت ویست دەری ببڕە بەڵام بە تەواوی نەك هەندێك لە دوای کارەکەت بڵێیت ئەو تر نەڵێت کەواتە ئێوە هیچتان نەکرد، مرۆڤەکان ئەگەر قسەتان کرد بە تەواوەتی قسە بکەن چونکە ئەگەر نیو قسەت کرد کەواتە تۆ هیچت نەکرد قسە نەکردنەکەت باشترە لە نیو قسە کەواتە یان بە تەواوەتی بێ دەنگ بە یان نیو بێ دەنگ مەبە، ئەگەر ڕازی نەبووی لە شتێك هەموو نا ڕازی بوونەکەت دەربببڕە چونکە ئەگەر نیو نا ڕازی بونت دەربڕی کەواتە تۆ ڕازی بویت مرۆڤەکان ئیتر بەسە ئێوە مرۆڤن نەك نیو مرۆڤ هەموو نا ڕازیەکانتان دەرببڕن چونکە ئەمە دەبێتە هۆی داهاتووی خۆت وە داهاتووی خۆت لە دەست مەدە چونکە یان ئەوەیە ڕازی بە یان ناڕازی بە چونکە نیو ناڕازی بوون واتە ڕازی بوون لەسەر هەموو شتەکان بۆیە وا دەڵێم خۆتان زەرەر بە خۆتان دەگەیەنن بە ڕاستی کارەساتە نیو مرۆڤ بن، مرۆڤەکان ئیتر بەخۆتان بیر کەنەوە کە نیو مرۆڤ بوون هیچ ناگەیەنێ جگە لە زەرەرێکی زۆر بە خۆی دەگەینێ بۆیە دەیڵێم وە دەیڵێمەوە تۆ نیو مرۆڤ نیت... تۆ مرۆڤیت... زۆر کاریگەرە...! مرۆڤەکان ئیتر بە خۆتان بیزانن کە چۆن ژیانتان بەسەر دەبەن وە ژیانێکی پڕ لە خۆشی بەسەر بەرن پڕ بێ لە واتای ژیان وە لە واتای مرۆڤی بە توانایەکی بەهێز کار دەکات بۆ مرۆڤایەتی بۆ ئەقڵێکی تەواو چونکە هەموو شتێك بە تەواو بیر کردنەوە دەبێت بڕیار دەدرێت بۆیە تۆ مرۆڤیت نەك نیو مرۆڤ.

## ٢- گەورەیی و میهرەبانی دایك

پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ دوعای لە فیرعەون کرد... بەڵام خودا دوعاکەی پاش ٤٠ ساڵ قبووڵ کرد! هۆیەکەشی... چونکە فیرعەون زۆر چاك و بە ڕوحم بوو لەگەڵ دایکی! پاش ئەوەی دایکی فیرعەون کۆچی دوایی کرد... خودا دوعاکەی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) قبووڵ کرد! بەهۆی چاکی و بەڕوحمی لەگەڵ دایکی خودا سزاکەی داناگرتە سەر ستەمکارێك وەك فیرعەون هەر چەندە لەلایەن پێغەمبەرێکەوە دوعای لێکرابوو! ئەمەش نموونەیەك لەسەر گەورەیی دایك " .ئەو ئافرەتەی بە دەستی ڕاستی لانك ڕادەژەنێت، بە دەستی چەپی جیهان دەلەرزێنێت...!" ئەمە وتنی ناپلیۆنە لە سەر دایك، دایك زۆر لە لای ناپلیۆن بە قیمەت بوو چونکە دەیووت ئەگەر دایك نەبوایە منیش نەدەبووم وە ژیانێکی پڕ لە ناخۆشی دەمبردە سەر چونکە ژیان بێ دایك زۆر خەموو و ژیانەکی تاڵ تاڵ دەمبردە سەر چونکە ژیان پێویستی بە دایکە تا میهرەبانیەکانی بزانین، بێ دایکی ئەگەر نەشتکوژێت، ئەوا جۆرە هەستێکت لەلا دروست دەکات کە تام و بۆنی مردنی لێبێت! دایك زۆر کاریگەرە لەسەر ژیان هەموو ژیان دەگۆڕێ ئەگەر دایك نەبوو ئەوە ژیان ئەستەمە چونکە ژیان پێویستی بە دایکە، دایك پێویستی بە منداڵەکانێتی بڵێ کە میهربانی چیە لە ژیان، ژیان پێویستی بە دایکە، دایك هەردەم چاوی لە دوو منداڵیتی هەر وەکو چۆن ئەم دایکە وتی: چۆن دەتوانرێت بووترێت کە

جەنگ پیرۆز نییە، لـە کاتێکدا کە کورەکەمی تێدا کوژراوە!، دایك بۆچی دەژیت؟؟ بۆچی ئامادەیە هەر کارێك بکات لە پێناو منداڵەکانی؟؟ بۆ ئەوەی منداڵەکانی ئاسودە بکات وە چاوەڕوانی داهاتوویێکی باش بۆ منداڵەکانی دەکات وە هەردەم دایك ژیانەکی پڕ لە ناخۆشی و ئازار دەبینێ وە دایك هەمیشە لە ژیاندا هەموو شتێك دەکات بۆ منداڵەکانی، ژیان بێ دایك تاڵە، ئافرەت دایکە، دایك ژیانە ژیان دایکە چونکە ئەگەر دایك نەبێ هیچ شتێك بوونی نابێ وە ژیان پێویستی بە دایکە تا میهربانی و منداڵ و ژیانەکی ئاسودەیی هەبێ ژیان بەردەوامە ئەگەر دایك هەبێ. دایك هەردەم دڵی منداڵەکانی خۆش دەکات بەڵام ئێمە هیچ کات چاکەکانی دایکمان بە بیر نییە، ڕۆژێك کەسێك دەچێتە لای ئیمامی عمر (ر.خ) دەڵێ: من دایکی خۆم لەسەر پشتم دانا حەجم پێ کرد وە هەموو کارەکانی حەجم ئەنجامدا ئایە من توانیم چاکەی دایکم بدەمەوە ؟؟؟ لە وەڵامدا ئیمامی علی (ر.خ) ووتی: تەنها چاکەی یەك جار ئازاری کە تۆی بووە نەت دایتەوە.

ئێمە هیچ کات چاکەی دایکمان پێ نادرێتەوە چونکە ئێمە هەردەم قەرزاری دایکمانین، خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویت ﴿فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾ واتا (تەنانەت) ئۆفیان لە دەست مەدە و هەرگیز پێیاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت، ئێمە زۆرجار وەڵامی دایکمان دەدەینەوە بەڵام بیر ناکەینەوە کە ئەوان چەند بۆ ئێمە ماندوو بوونە یان بۆ ئێمە چیان کردووە یان

میهرەبانیەکیانی چەند بووە، ئێمە هەمیشە دەڵێین ئەوان چیان کردووە بۆ ئێمە؟؟ بەڵام ئایا هیچ کاتێك پرسیارت لەخۆت کردووە کە ئێمە چیمان بۆ کردووە؟؟ مرۆڤ تۆ تەنها بیر لە خۆت مەکەرەوە چونکە کەسێك هەیە هەردەم پشتگیریت دەکات بەڵام ئێمە هەست پێ ناکەین ژیان بە دایك خۆشە، کەس نازانێ قەدری دایك چەندە تا بێ دایکی نەبینی ئەو کات دەزانی چەندە، ئەوەیە میهرەبانی و گەورەیی دایك، ئەوەیە ڕاستی دایك وە ئەوەیە ڕاستی ژیان. من سێ پێڵاو ماچ دەکەم تەنها سێ پێڵاو.. تاکێکی هی "باوکم" و دوو جوتەکەی تریش هی "دایکم" چونکە دایك ئەو ئازارەی دەکێشی کە تا منداڵەکانی گەورە دەکات وە فێری ڕەوشت و ئەخلاق دەکات هەمیشە پشتگیریان لێ دەکات وە پێیان دەڵێ سەرکەون لە ڕکی ناحەزەکانتان پشت بە دایکتان ببەستن بۆ هەموو کات چونکە دایك دەیەوێ ڕۆلەکانی سەرکەون بۆ پلەیەکی زیاتر کە وەك خۆیان دەیانەوێ چونکە دایك هەمووکات بیر لە منداڵەکانی دەکاتەوە تا بتوانین سەربکەون ژیانێکی پڕ لە ناخۆشی دەباتە سەر تا منداڵەکانی دڵ خۆش بێ کەچی ئێمەش وا هەست دەکەین گشت سەرکەوتنەکانمان لە ڕێگای خۆمانە دەڵێین ئێوە چیتان بۆ ئێمە کردووە وا زۆر لێیان ناڕازین کەچی بۆ یەك جاریش هەست پێ ناکەین کە ئەوان چ ئازارێکیان بردوەتە سەر تا ئێمەیان گەیاندۆتە ئەو ڕۆژە ئێمەش ناڕازین کە ئەوان شایەنی باشترینن کە ئێمە بۆیان بکەین چونکە هەرچیەکیان بۆ بکەین هەر کەمە و ناتوانین چاکەی دایکمان بدەینەوە چونکە ئێمە هەر قەرزاری دایکمانین، دایك هەمەیشە پشت بە

منداڵەکانی دەبەستێ چونکە هیوا و تامەزرۆیی بینینیانە تا ئەو کاتەی سەردەکەون چونکە ژیان پێویستی بە سەرکەوتنە بەڵام سەرکەوتن بە بێ دایك زۆر ئەستەمە. ژیانێك ئەگەر دایکی تیا نەبێ واتە ژیانێکە کە هیچ واتایەك نابەخشێ بە مرۆڤ چونکە مرۆڤەکان بێ دایکی ببینن ئەوکات دەزانن هەست بە چ بێزاری دەکەن هەست بە ناخۆشی دەکەن هەست بە مردن دەکەن ژیانێکی تاڵ تاڵ بەسەر دەبەن ئەو ژیانەی کە هەرگیز تامەزرۆیی بینینی نەبووە چونکە ئەگەر دایك نەبێ ژیان دەگۆڕێ میهرەبانی نامێنێ واتای خۆشەویستی خێزان نامێنێ خێزان تێك دەچێت وە هەردەم ئاوات دەخوازی کە دایکت بگەڕێتەوە وە بیر لە قسە خۆشەکانی دەکەیەوە وە نا ئارامی لە خۆت بیر لە قسە خۆشەکانی دەکەیەوە وە بگەرێتەوە وە بیر لە قسە خۆشەکانی دەکەیەوە وە نا ئارامی لە خۆت دەبینی هەست بە هەڵەکانت دەکەی بەرامبەر بە دایکت، مرۆڤەکان تا کەسێك لە دەست نەدەن نازانن قەدر و قیمەتی ئەو کەسە چەندە لە لای ئەو چونکە ژیان قەدری هەموو کەس دەزانێ بەڵام ئێمە قەدری دەورو بەرمان نازانین تایبەت خانەوادەکەمان چونکە خێزانمان فێری زۆر شتی کردوین وە چاکەیان نادرێتەوە ئێمە بۆ یەك جار سوپاس گوزار نابین لە خودا کە دایکمان هەیە بەڵام کە لە دەستمان دا ئەوجا قەدر و قیمەتمان دەزانین وە پەشیمانین بەڵام پەشیمانی لەچی کە ئێستاکە هیچمان لە دەست نایێ ئەوکات خۆمان تاوانبار دەکەین بەڵام سوودی نییە کات بەسەر چووە ئەی مرۆڤ واتای دایك بزانن ئەی مرۆڤ بەخشندەیی دایکتان و میهرەبانی و گەورەیی

دایکتان، ئەوەش بزانن چۆن وادەکەن کە دایکتان لێتان ڕازی بێ چونکە ئەگەر دایکتان لێت ڕازی نەبێ ئەوە خوداش لێت ڕازی نابێ ئەوەش کارەساتە بۆ مرۆڤ کە نەتوانێ دڵی خۆشەویسترین کەسی ڕازی بکات بۆ خۆی، وە لە مرۆڤێکم پرسی وتم: میهرەبانی دایکت چی بوو بۆت؟؟؟ ووتی: چیرۆکی من و دایکم دوور و درێژە ئەگەر حەز دەکەی بۆت دەگێڕمەوە؟ ووتم: بە خۆشحاڵیەوە، وتی: چیرۆکی من ئەوەیە:

دایکی من تەنها چاوێکی هەبوو لەوەتەی کە چاوی نەبوو نەفرەتم بوو لێی، شەرمم دەکرد کە ئەوە دایکمە، من لە پۆلەکانی سەرەتایی دەرسم دەخوێند، ڕۆژێکیان بۆ لێپرسینی دەرسەکانم هات بۆ قوتابخانە، کە هاتە ناو قوتابخانە یەکەم جار سلاوی لەمن کرد، من زۆر شەرمەزار بووم لەناو هاوپۆلەکانم، زۆر تەریق بوومەوە.

دوای ماوەیەك گۆشەگیر بووم، کە منداڵەکان دەیان گوت دایکت تەنها چاوێکی هەیە، نەفرەتم بوو لە دایکم ئاخر چۆن توانی ئەو کارە لەگەڵم بکات و بێت بۆ قوتابخانە من شەرمەزار بووم، من دەمویست بە جۆرێك هەڵێم و خۆم گوم و گۆڕکەم، یان دایکم بە جۆرێك لە ناو بچێت، چەند ڕۆژ دواتر دایکم بە تەنها دەچووە ژوورەکەی و مات و لوول دادەنیشت، ڕۆژێکیان پێم گوت: تۆ بۆچی بوویتە مایەی پێکەنین و شەرمەزاری بۆ من؟ بۆ نامری لەناو بچیت؟ دایکم هیچی نەگوت، من بەبێ ئەوەی تەنها یەك چرکە بیری لێ بکەمەوە نەفرەتم بوو لە دایکم، هیچ بایەخێکم بە هەستی دایکم نەدەدا، تەنها دەمویست لەو ماڵە بڕۆم و دوور کەومەوە، بە سەختی وانەم دەخوێند بۆ ئەوەی کە شانسی خوێندنم لە وولاتێکی

ئەوروپی بە دەست هێنا، من چوومە دەرەوە و خوێندنم تەواو کرد و خانووم کڕی و بوومە خاوەنی ژن و منداڵی خۆم و بە خۆشی ژیانم دەکرد، تا ئەوەی ڕۆژێکیان دایکم هات بۆ سەردانم، ئەم چەند ساڵە بێ ئاگابووین لە یەك و تەنانەت منداڵەکانی منیشی نەدیتبوو و نەیدەزانی من منداڵم هەیە کاتێك هاتە نێو دەرگاکە ڕاوەستا منداڵەکانم پێی پێکەنین، منیش کە کەوتمە بیری منداڵی خۆم قیڕاندم بەسەریا و بە دەنگی بەرز ووتم چۆن ئەو ئازایەتیەت هەبوو بێی بۆ ماڵی من! بڕۆ دەرەوە لە ماڵی من! دایکم ووتی: ئاه ه ه بمبورە پێم وابێ ناونیشانەکە بە هەڵە هاتووم، پاشان ڕۆیشت و لە بەر چاو وون بوو.. ڕۆژێکیان لەلایەن قوتابخانەوە نامەیەکم بە دەست گەیشت سەبارەت بە کۆبونەوەی مامۆستایان. بەڵام من بە درۆ بە ژنەکەم ووت سەفەرێکی کاریم بۆ پێش هاتووە دەڕۆم.. من چوومەوە بۆ ماڵە کۆنەکەمان کە دایکم تێیدا دەژیا، بەڵام جیرانەکەمان ووتی مردووە، من تەنانەت یەك دڵۆپە فرمێسکیشم نەڕشت. جیرانەکان نامەیەکیان پێدام ووتیان ئەمە دایکت بۆ تۆی نووسیوە کە هەر کات هاتی بۆ سەردانی بیدەین بە دەستت: ئەی ئەزیزترین کەسم، ئەی کوڕە جوانەکەم... من دایم بە یادتەوە بووم، بمبوورە کە هاتم بۆ ماڵەکەت و منداڵەکانتم ترساند، زۆر خۆشحاڵ بووم کاتێ بینیم ماڵ و منداڵت هەیە، هەر چاوەڕێ بووم ڕۆژێك سەردانم بکەی، بەڵام لەوە دەترسام کاتێ تۆ بێی ئیتر من نەتوانم لەسەر قەرەوێلەکەم هەستم و چاوت لێ بکەم، بمبوورە کە تەنها چاوێکم مابوو، کاتێ تۆ منداڵ بووی بە باوەشمەوە لەناو سەیارە بووین کە

خۆلێکدان پێش هات و چاوێکت لە دەستدا. من وەکو دایکێك کە دەمبینی تەنها چاوێکت هەیە و خەریکی گەورەتر دەبی... دڵم پڕ دەبوو لە ژان. هەر بۆیە چاوێکی خۆمم دا بە تۆ، بۆ من شانازی بوو کە کوڕەکەم چاوی بە دەست هێناوە و دەتوانێ بە ئاسوودەیی ژیان بەرێتە سەر.. لە جیاتی من بە دوو چاو سەیری دونیایەکی خۆش بکەم، هەموو ئەشق و خۆشەویستیم پێشکەش بە تۆ کوڕە جوانەکەم ئینجا وتی وە بە دانگی گریانەکی لەنا ناخدا: تازە زانیم کە دایکم چەند میهرەبان بوو بۆ من بەراستی تا ماڵ ئاوایی نەمرد نەمزانی دایکم چەند بۆ من بە وەفا بوو نەمزانی دایکم هەموو شتێکی بۆ من کردووە کەچی من لە هەموو شتەکانی بێئاگا بووم بەڵام کە کارە گرینگەکەم زانی ئەوجا پەشیمان بوومەوە کە من چەندە هەڵە بووم کە نەمتوانی قەدری دایکی خۆم بگرم بەڕاستی تا ئێستا هەر لەو ئازارەدا دەژیم نازانم چۆن هەڵەکانی خۆم چاك بکەمەوە ئەمە ڕاستی چیرۆکی من هاورێ. کە ئەمەم بیست چاوی پڕ گریان بوو هیچم نەما بۆ ووتن تەنها سوپاسم کرد کە لەگەڵم قسە کردووە چیرۆکی خۆی بۆ گێڕامەوە وەبەڕاستی چیرۆکێکی پڕ لە خەم بوو وە پڕ لە ئازار بوو وە کاریگەر بوو دایکمان زۆر بە میهرەبانە بۆ ئێمە بەڵام ئێمە قەدری نازانین بەڕاستی کاریگەرە بۆ مرۆڤ کە لە دایکی خۆی بێزار بێت چونکە جێی شەرمەزارییە بۆ مرۆڤ کە نازانێ دایکی بۆ ئەو چی کردووە وە لە هەمان کاتیشدا گلەیی لە دایکمان بکەین وە نەزانین ڕاستەکەی چییە وەچۆن ئێمەیان پێگەیاندووە وەچۆن ئێمەیان گەیاندۆتە ئەم ڕۆژە کە تێدا دەژین وە هەست بە ئازارەکانی دایکمان

ناکەین وە هەست بەوە ناکەین کە دایکمان چەندەها ئازاری چەشتوە تا گەیاندۆتە ئەم ڕۆژە، جێی شەرمەزاریە بۆ مرۆڤ کە ئەم شتانە هیچ نازانێ وە گلەیش بکات لە دایکی چونکە تا ڕاستیەکان نەزانین ناتوانین قەراریش بدەین مرۆڤەکان بزانن کە دایکتان بۆ ئێوە چەندە بە سۆز بووە بەڵام هەرچیەك بکەن دایکتان هەر ئێوەی خۆشدەوێت منداڵێك کە لە گۆشتی خۆی بێ هەردەم سوپاس گوزاری خودا دەکات کە منداڵێکی داوەتێ کەچی ئێمە دەڵێین بریا ئەم دایکەمان نەبوایە یان شەڕی لەگەڵ دەکەین هەردەم پەشیمانی ئەوەش دەبینەوە دڵنیام مرۆڤەکان چونکە هەردەم دایکتان ئێوەی خۆشدەوێت بۆیە هیچ جار دڵی دایکتان مەشکێنن وە هەردەم بە قسەی بکەن وەتا مردن پێی بڵێن دایەگیان خۆشم دەوێی بەڕاستی کاریگەرە ئەگەر قەدری دایکتان نەزانن، مرۆڤ ئێوە بزانن کە دایکتان چەند میهرەبانە بۆ ئێوە بزانن کە چۆن قەدری دایکتان بزانن وە ئەمە ڕاستی دایکتانە وە ئەمەش ڕاستی ژیانە.

# ٣- هــاوڕێ

ڕۆژم لەسەر لێمەدە هاوڕێ، ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە، ئێستا هاوڕێ ئەو هاوڕێیە نیە کە کۆن هەیان بوو ئێستاکە زۆر جۆر هاوڕێ دەبینین هاوڕێی باش و هاوڕێی خراپ و هاوڕێی بەرژەوەندی و... ئێمە هاوڕێی خۆمان دەبێ باش بناسین وە دەبێ تاقیان بکەینەوە ئایە دەردەچن لەو تاقیکردنەوە، کەس نەڵێ من هاوڕێی خۆمان دەناسم تا تاقی نەکیتەوە ڕاستی دەر ناکەوێ، ژیان پێویستی بە ڕاستیەکانیەتی، تۆش تاقی بکەوە بزانە ئەوەی تۆ دەتویست هەبوو؟؟؟، تا ڕاستیەکە نەزانی ناتوانی وەڵام بدەیتەوە ئەگەر وەڵامت دایەوە ئەوجا بیڵێ هاوڕێی باشم هەیە، مرۆڤەکان دونیا ڕاستی ئێوەی دەوێ ئێوەش یەکترتان خۆش بوێ، هاوڕێ واتە برای دەرەوەت، ژیانی ڕاستی واتە هاوڕێی ڕاستی واتە نهێنی پاراستن، ڕۆژێك دوو هاوڕێ بەسەرِ دێن پاشان یەکێکیان نامەیەك بۆ ئەوی تر دەنێرێت دەڵێ: نهێنیەکانی من ئاشکرا مەکە باشە، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: من لەگەڵ تۆ بەشەرِ هاتیمە نەك لەگەڵ نهێنیەکانت ئێستا ژیان بە جۆرێك گۆڕاوە کە وامان لێ هاتووە متمانە بەکەس نەکەین وە مرۆڤ بە جۆرێك شێواوە کە ناتوانێ متمانە بە کەس بکات ژیان پێویستی بە ڕاستیە ئێوەش ڕاست بن لەگەڵ یەکتری باش بن لەگەڵ یەك ژیانتان با بەیەکەوە بێت، ئەی مرۆڤ ئێوە وابکەن کە هەردەم پشتان بە یەکەوە توووند بێ خۆتان مەگۆڕن بۆ هیچ کەسێك با مرۆڤەکان لەسەر ڕەوشتان بگونجێن تا بزانن ئێوە کەسێکی

چۆنن ئێوە ڕاست بن لەگەڵ یەك زەمی خەڵکی تر مەکەن ژیانتان خۆشکەن بە هاوڕێی باش چونکە هاوڕێی باش هەردەم لەگەڵت دایە ئەی مرۆڤ ژیانت بەختەوەر بکە تا ژیانتان باشتر بێ تا دڵ خۆش بن لەگەڵ یەکتر ڕاست بن لەگەڵ یەك هەموو شت باش دەبێت هاوڕێ.

کاتێك کە تەنیاین، بە دوای هاوڕێدا دەگەڕێین، کاتێك کە دۆزیمانەوە، بە دوای لاوازییەکانیدا دەگەڕێین، کاتێك کە لە دەستماندا، لە تەنیاییدا بە دوای یادەوەرییەکانیدا دەگەڕێین؟ دەبێت قەدری هاوڕێیەتی بزانین کە بزانین هاوڕێیەتی ئەگەر نەمێنێ ژیانمان نامێنێ تایبەت هاوڕێی باش چونکە هاوڕێی باش جێی متمانە بێ دەتوانین هەموو نهێنیەکانی خۆت باش بکەی ئەوەش بۆ مرۆڤ زۆرباشە چونکە کەس ناتوانێت هەموو شتەکانی ناخی هەڵبگریت مرۆڤ کاتێك کە خەم دەخوات ئەگەر بێت و لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی قسە بکات بۆی باس بکات ئەوە بۆ مرۆڤەکە زۆر باش دەبێ چونکە لە ڕووی نەفسیەوە ئارامی دەکات چونکە ئەگەر هاوڕێیەکت هەقی گریان بێ ناهێلێت بگری چونکە هەردەم دڵت دەداتەوە تا هەست بە تەنیایت نەکەی وە هەردەم لە هەمووکات لەگەڵت دایە هاوڕێی باش هەمیشە لە خۆشی و ناخۆشی لەگەڵت دایە بەوە دەڵێن هاوڕێیەتی، زەمەنێك دێ، مرۆڤ ئامادەیە دەست لە هەموو شتە مادديەکانی دونیا هەڵبگرێ تەنیا لە پێناو دۆزینەوەی کەسێك کە هاوخەمی بێت بۆیە تا ئەو کاتە نەهاتووە قەدری هاوڕێیەتی بزانن چونکە مرۆڤ هەردەم لەگەڵ هاوڕێیەکانی دڵ خۆش دەبیت وە هەمیشە هەر ئەو هاوڕێیەیە هاوبەشی خەمتە، هاوڕێکەم هیچ کات نابێ بزانێ کە

من هەست بە ئازار دەکەم بەڵام لە هەمان کاتدا ئازارەکانی خۆمم بۆ باس دەکەم وە بە خۆم دەڵێمەوە ئایە دەبێ هاوڕێیەکەم ئازار نەکێشێ منیش هەستی پێ ناکەم واتە دەبێ ئاگاداری قسەکانیشمان بین لە خۆمان نەرەنجێنین. هاوڕێی خراپ ئەوەی لە کەسە نزیکەکانم ببینم بە خەیاڵی کەسە دووژمنەکانیشم نەدەهات، هەردەم هاوڕێی خراپ فێری شتی خراپت دەکات وە لە کاتە ناخۆشەکان پشتت تێدەکات وە هەمیشە بۆ ئیشەکی خۆی لەگەڵتدایە، مرۆڤەکان ئەمانە بزانن جیاوازی نێوان هاوڕێی خراپ و باش بزانن چونکە تا بتوانن لە یەکتریان جیا بکەنەوە، هاوڕێ گیان.....!! لە گەڕەکەکەی ئێمە هاوار بۆ خەم مەکە کەس لێت ناکرێ مەگەر من!! جا بۆ ئەوەی زەرەر نەکەیت وەرە پێکەوە شادی بفرۆشین گوێ بۆ خەمی ناخمان نەدەین...! هاوڕێکەم هەردەم دڵخۆشبە تا بتوانم خەندە لە لێوی تۆ ببینم چونکە حەزناکەم کەس دڵی تۆ بشکێنێ، هاوڕێ چونکە تۆ بەشێکی لە دڵی من هەموو شتێکی خۆم بۆ تۆ دەڵێم چۆن دەبێت کەسێك دڵی من بشکێنێت کە هاوڕێمە وە متمانە زۆر بەو هاوڕێیەم دەکەم، هاوڕێیەکەم هەردەم دەبێ دڵخۆشبی تەنها بۆ من نا بەڵکو بۆ خۆشت چونکە خۆشی تۆ خۆشی منە هاوڕێ تۆ هەست بە ئازار ناکەی منیش هەستی پێی ناکەم وە تۆ خەم ناخۆی منیش خەم ناخۆم، هاوڕێ گیان لە پێشمدا مەڕۆ لەوانەیە نەتوانم بەدوات بکەوم، وە لە دوامدا مەڕۆ لەوانەیە نەتوانم سەرکردایەتیت بکەم، بەڵام هاوڕێم بە و لە تەنیشتم بڕۆ، چونکە هاوڕێیەتیمانزۆر بە هێزترە کە مرۆڤەکان دەیزانن هاوڕێکەم دڵ گران مەبە چونکە منت لەگەڵە هەر

پێکەوە دەژین وە بە یەکەوەش بەربەست لا دەبەین چونکە ئێمە هاوڕێین وە هەر هاوڕێش دەبین ئەمە واتای هاوڕێیەتیە ئەی مرۆڤ خۆتان بزانن کە هاوڕێتان کێیە.

لە ژیاندا سێ شت هەن کە خۆشەویستی لە دڵی دۆستەکەتدا جێگیر دەکات ئەوانیش:

یەکەم: تۆ دەست پێشخەری بکەیت لە سڵاو کردن لێ ی ...

دووەم: جێگای بۆ بکەیتەوە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا...

سێیەم: وە بە خۆشترین ناو بانگی بکەی کە خۆی پیێ خۆشە

زۆربەی مرۆڤەکان بەو کەسانە دەڵێن ئەمانە ماستاویان بۆ پاك دەکەنەوە بەڵام لە ڕاسیتدا ئەمانە تەنها ڕێزێکە بۆ هاوڕێکەت ئەم جۆرە ڕێزە لەو کەسانە بگرە کە خۆشت دەوێن کە هاوڕێی باشن چونکە شایستەی ئەو جۆرە ڕێزگرتنەن ئێوەش بزانن چۆن مامەڵە دەکەن لەگەڵ ئەم هاوڕێیانە چونکە بەڕاستی شایستەی ئەو ڕێزەن چونکە هەمووکات بە ڕێزەوە مامەڵەت لەگەڵ دەکەن وە لە هەمو شوێنێك باسی تۆ دەکەن وە شتێك مەکە کە پەشیمان بن لە قسەکانی خۆیان چونکە ئەوان ڕێزت لێدەگرن تەنها لەبەر ئەوەی کە تۆیان خۆشدەوێت نەك تەنها بۆ ئیشی خۆیان چونکە ئەو کەسانەی تۆیان خۆشدەوێت هەردەم ناوت دێنن وەباسی تۆ دەکەن لە هەموو شوێنێك بە باشە، قسەی خۆشت بۆ دەکەن لەکاتی ناخۆشیەکان ئەمەش هەموو شتێکە لە ڕووی مرۆڤیەوە، مرۆڤەکان بزانن چۆن قەدری یەکتر دەگرن چونکە ئێوە خاوەن هاوڕێی باشن باشترین مرۆڤ خاوەن ڕەوشت و کەرامەت بێ

هەردەم هاوڕێکانیشی خۆش دەوێت چونکە دەزانی کەڕامەتی هاوڕێکەشی هەر هی ئەوە هاوڕێی ڕاستی هەمیشە لەگەڵتە مرۆڤەکان هاوڕێیەتی خۆتان بەهێز بکەن تا بتوانن لەسەر دووژمنەکانتان زاڵ بن، کە ڕێزیان دەگری وا دەزانن حەق بۆ خۆیانە، یەك جاریش ئەو ئەگەرەت پێنادەن، کە لەوانەیە ئەو ڕێزگرتنەی ئێمە بۆ ئەوان لەبەر پەیوەندی نێوانمانە یا هاوڕێیەتیە بۆ ئەوان، ئیتر بە کورتی بەم جۆرەیە: کاتێك زۆر بۆ کەسێك باش دەبی، لە کۆتایدا... پاش ماوەیەك هەم خۆیان و هەم تۆش وون دەکەن!... ئەم دونیایە پڕە لەو کەسانی کە یەکتریان وون کردوەن، ئەی خەڵکینە وا مەکەن کە یەکتر وون بکەن چونکە هەر ڕۆژێك دێت خۆتان بەرپرس دەبن کە هاوڕێکەتان لە خۆتان دوور کردووتەوە تەنها هاوڕێیە باشەکانت نەك خراپەکانت هەر چەند لە هاوڕێیە خراپەکانت دوور بی هەر کەمە چونکە هەردەم فێری ڕەوشتی خراپت دەکەن وە تووشی کێشەی گەورەت دەکەن وە ڕزگاریشت ناکەن بە جێت دەهێلن، بەڵام هاوڕێی باش هەردەم باسی شتی باش وەفێری کاری باش وە لەکاتی تەنگانە دەگاتە لات وە هەردەم پشتگیریت دەکات لە هەمووکات وە بەخشندەیشت دەداتێ وە هەردەم بەرزت ڕادەگرێ، هاوڕێی ڕاستەقینە ئەوەیە کە هاوڕێی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەو کاتەی جیهان هەمووی لێت دوور دەکەوێتەوە بەڵام ئەو لێت نزیك دەبێتەوە. هاوڕێ هیچ شتێك هێندەی ماڵئاوایی بە ئازار نیە! ناخۆشترین وشەیە لەلای من ژیان قەت وام لێنەکەی کە بە هاوڕێیە خۆشەویستەکانم بڵێم ماڵئاوا چونکە هەموو ناخم دەهەژێنێ کاتێك بە

هاوڕێیە خۆشەویستەکەم دەڵێم ماڵئاوا بەس هاوڕێیەکەم ئەمە بزانە تا دوا هەناسەم لەبیرت ناکەم چونکە بەهای تۆر زۆرە لەلای من هاوڕێیەکەم هەردەم چاوەڕێی گەڕانەوەت دەکەم، مرۆڤەکان ئێوەش قەدری هاوڕێیەتی بزانن تا بتوانن باش بن لەگەڵ هاوڕێیەکانتان وە هەوڵ بدەن هاوڕێی زۆرتان هەبێ.

حەکیمێك دەڵێ: با هەزار دۆستت هەبێ هەر کەمە، بەڵام یەك دوژمنت هەبێ هەر زۆرە، ئەمە واتای ژیانە ئەگەر هاوڕێی باشت هەبێ وە ئەمەش ڕاستی ژیانە، خراپترین شتی ژیان ڕاکردنە لە مەیدانی جەنگ و خیانەتکردنە لەگەڵ هاوڕێ و خۆشەویستەکەت.. خیانەت کردن لە هاوڕێکانت هیچ کات لە یادی ناکەی چونکە ڕۆژێك دێت وە تۆڵەت لێدەکەنەوە چونکە هاوڕێیەکانت هیچ کات لەبیر ناکەن وە ڕۆژێك دێت پێت دەڵێنەوە تۆڵە سەندنەوەش دەکەن هاوڕێکانتان لەخۆتا دڵگران مەکەن چونکە ژیان بەردەوامە ڕۆژێك بۆ تۆ ڕۆژێك بۆ ئەوە بۆیە هەردەم خۆتان بپارێزن لە خیانەت چونکە مرۆڤەکان دڕندەن لە کاتێك کە زۆر توڕەن ئەویش بەهۆی تۆوەیە ئەمە دەبێتە هۆی کێشەیەکی زۆر گەورە ئەمەش نابێتە قازانجی تۆ تۆش بتوانە چاکەکانت بەدیار بێخی خۆت بناسێنە کە تۆ کەسەکی باشی بەڵام خیانەت کردن هەموو ئەو شتانە لەبیر دەکات ئەم شتانە بزانە پێش ئەوەی ڕووبدات، مرۆڤەکان هەردەم باش بن نەك خیانەت بکەن چونکە ئەم خیانەتە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی مرۆڤایەتی و بێ باوەڕی ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ، زۆر پێدەچێت تا متمانە لەلای هاوڕێیانت پەیدا دەکەی بەڵام لەوانەیە یەك

هەڵەی خۆت هەمووی لەناو ببەی بە یەك ووشە یان بەیەك کاری هەڵە، هاوڕێیەتی زۆر لەوە گەورەترە کە ئێوە لێی دەزانن، ڕاستی ژیان پەیوەستە بە ڕەوشتی مرۆڤەکان لە بەرامبەر هاوڕێکانی ئەمەیە ڕاستی ژیان. هەروەکو چۆن (فۆدۆر دایستۆیڤسکی) دەڵێ: من ئەم ئێوارەیە دڵی مرۆڤێکم شکاند، خێرا چووم ئاشتم کردەوە گووتم نەکا ئەم مرۆڤە نەگات بە شەو بمرێت، دەی ئەم ژیانە ئاوا کورت و بێ مانایە هەندە ناهێنێت دڵێك بشکێت یان دڵێك بشکێنیت...! هاوڕێکان ئەمەیە ڕاستی ژیان دەبێ هیچ کات خۆمان لە یەکتر توڕە نەکەین مرۆڤەکان با هەردەم دڵی یەکتر خۆش بکەین و زەردەخەنەی بخەینە سەر لێوی هاوڕێکانمان ڕاستی ژیان وایە چونکە دڵ شکاندنی یەکتر واتە نەمانی هەست و سۆز واتە نەبوونی خۆشەویستی یەکتر مرۆڤەکان دەبێ ئەم شتانە بزانن تا بتوانن کەسانی سەرکەوتوویان لێ دەرچێ هەردەم شانازی بە هاوڕێکانت بکە چونکە ڕۆژێك دێت پاداشتت دەدەنەوە ڕاستی هاوڕێیەتی بزانە پێش ئەوەی هاوڕێیەتی بکەی چونکە هەر هەڵەیەك بۆ تۆ زۆرە مرۆڤەکان ژیان بەردەوامە هاوڕێی خۆت بناسە و ڕاستی ژیان بزانە چونکە تۆ مرۆڤیت.

## ٤- هاوسەرگیری

ژن و پیاوی زۆر هەن، کە دەتوانن لەگەڵ یەکتردا بخەون، بەڵام ڕێژیەکی کەم هەن کە بتوانن بیر لە یەکتر بکەنەوە و بەئاگابن !... هاوسەرگیری یەکێکە لە کێشەکانی ژیان کە ئەگەر بێت و ڕۆژێك دووچاری ژووری مەحکەمە بیت و رووبەرووی کێشەکانی ژیان بۆستیت، ئەگەر پەیوەندی نێوان دایك و باوك تێك بچێت زەرەرەکەی بۆ منالەکانیان ئەگەرێتەوە چونکە منالّ دەسەلاتی نەبووە بەسەر دایك و باوکی، ژیانی راستی پێویستی بە خێزانی راستەقینەیە وە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و مهرەبانی ژیانێك کە بزانرێت کە واتای خێزان چیە، مرۆڤەکان ئەوە دەتوانن ژیانی خۆتان دابین بکەن وە ئەو هاوسەرەی خۆتان دەتانەوێ بیدۆزنەوە ژیانی دابین بکەن نەوەی داهاتوو دروست بکەن ژیان پێویستی بە خێزانی سەرکەوتوو هەیە، لە ئارامی دا بژین لە ژیانتان راست بن لەگەڵ خێزانتان راستگۆبن ، لە ناو هەموو خێزانێك کێشەیەك هەیە بەڵام هیچ کات وامەکەن لە لای یەکتری قەدرتان بشکێ چونکە یەك جار قەدرتان شکا لای یەك ئەوە هیچ کات وەك خۆی لێناێتەوە، خێزان ووشەیەکی پیرۆزە وە هاوسەرگیری چارە نووسی خۆتان دیاری دەکات دەبێ خۆتان هەوڵ بدەن بۆ ژیانێکی نوێ پڕ لە خۆشی و کامەرانی پڕ لە واتە بوونی خێزان ژیانتان ئاسودەبکەن منداڵەکانتان پەروەردە بکەن بە باشترین شێوە تا خەلك بزانێ کە دایك و باوکی چەندە باشیان هەیە تا بزانن ژیانی راستی چیە ئەوەیە راستە

ژیان ئەی مرۆڤ خۆت هاوسەری خۆت بدۆزەوە . مرۆڤەکان هەردەم دەبێ کەسێك لە ژیانی خۆیان هەڵبژێرن کە هاوبەشی خەمیان بێ وە لە رووی بیرکردنەوە وە لە روی مێشکەوە وەك یەك بن چونکە ئەگەر بێت و وەك یەك بیر نەکەنەوە واتە ئەمە دەبێتە کێشەیان و ئەگەر یەك جار ببێتە کێشەیان وە لەم کێشەیە جنێو بە یەك بدەن ئەگەر چاکیش ببنەوە بەس رێزی خۆیان هەر لە لا شکاوە واتە کێشەیان هەر بەردەوامە ژیان پێویستە مرۆڤەکان بەخۆیان ئەو کەسە هەڵ بژێرن کە بە خۆیان دەیان هەوێ نەك لە رێگای ئەو کەسانەی دەیەوێ بە زۆر زۆرداری بیاندەنێ یان بۆیان بهێنن چونکە لەم سەردەمەدا برێك ئەم عادەتە لە ناومان ماوە بەڵام نابێ بهێڵین و بمێنێ ژیانمان پێویستی بەو کەسانە نیە کە خۆمان هەڵیان نابژێرین ژیان پێویستی بەو کەسەیە کە بەخۆمان هەڵیان دەبژێرین . ژیانمان دەبێ لەگەڵ ئەو کەسە بێ کە خۆمان هەڵی دەبژێرین نەك ئەو کەسەبێ کە بەزۆرداری لەگەڵی دەنگونجێین چونکە هەر شتێك بووە زۆرداری ئەمە هەر رك و کینەی لە ناو دڵە هەمیشە حەز دەکات لە یەك جیا ببنەوە ژیان پێویستی بە باشترینە ئەو باشترینەی کە خۆمان دەمان هەوێ نەك ئەو کەسەی کە بۆمان بدۆزنەوە بە دڵیشمان نەبێ، من پێم باشە هاوسەرگیری لەرێی خۆشەویستیەوە بێت تا ئەگەر هەر شتێك بوو هەر خۆشەویستیان بمێنی یان ئەگەر هەر کێشەیەك بوو دەبێ لەگەڵ یەك بگونجێن چونکە دەڵێن بە دڵی خۆتان بوو ئەمانیش ئەم شتیان لە پێش چاوە کە بەخۆیان هاوسەرگیری خۆیان دانە بۆیە ژیان پێویستی پێیە کە بزانن چۆنن واتە

ڕەوشت وە ئادابیان وە چ جۆرە کەسێکن وە لە روی مێشکیەوە چۆنن وە هەست بە ناخی یەکتر بکەن ئەمە هاوسەرگیری سەرکەوتووە چونکە دەبێ باش لە یەکتر شارەزا بێت تا بتوانن لە یەکتری تێبگەن تا بتوانن خۆشی ببخەشنە یەکتری یان خۆشحاڵبن لە ژیانیان، ژیان دەبێت وابێت مرۆڤەکان خۆتان دەبێ بریار بدان بۆ هاوسەرگیری چونکە خۆشی ژیانتان لە دەست خۆتانە نابێ بە فیرۆی بدەن ئەم خۆشیە ئەم ئاسودەییە لەگەڵ یەکتر بەشیکەن لە ژیان چونکە بەراستی ژیانی سەرکەوتوو وە ژیانێکی پر لە خۆشی پێویستی بەو مرۆڤانەیە کە بە خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری دەکەن ، لە ژیان دا زۆر بەی مرۆڤەکان هەر بە خێزاندار تەواو دەبێت چونکە هەر وەکو ئیمامی (عمر) دەڵێ )) : هاوسەرگیری و خێزان دانان نیوەی ئیمانە )) واتە بە بێ هاوسەرگیری یان بە بێ خێزان هیچ واتای ژیان ناگەیەنێ واتە مرۆڤەکان ئێوە پیویستە خۆتان ژیانی خۆتان تەواو کەن ئەو کەسەی کە هاوبەشی خەمتان دەبێت ئەو کەسەی کە هەردەم ژینتان خۆشتر دەکات ، لە کەسێکم پرسی وتم : هاوسەرگیری لای تۆ چی دەگینێ ؟؟؟ وتی: هاوسەرگیری ژیانت دیاری دەکات کە بۆچی هەوڵ دەدەی وە بۆچی دەکەی بۆچی کاردەکەی دابەش کردنی پارەکە لە رۆژانە چۆن دەبێت چارەنووسی خۆت ئەوکات دەدۆزیەوە کە کەسێك هەیە هاوبەشی خەمتە لە ژیانت وە هەر دەتوانن ئەم کێشەیە بە یەکەوە چارەسەری کەین بەراستی هاوسەرگیری کارێکی پیرۆزە لە ژیان چونکە ژیانت هەموو دەگۆرێت بۆ ژیانێکی نوێ. ئەگەر بێت سەیری ژیان بکەین بە

یەك هاوسەرگیری ژیانمان دەگۆرێت واتە ئەو ئاواتەی کە لە پێش هاوسەرگیری هەمان بوو هەموومان لە دەست دەروات چونکە هاوسەرگیری بەرەو ژیانێکی نوێیە بەرەو ئاواتەکی نوێیە چارەنووسی خۆمان بە کێ دەبستینەوە ئەو کارانەمان هەمووی بۆ دەر دەکەوێ بۆیە پێویستە مرۆڤەکان چارەنوسی خۆیان بزانن کە لەگەڵ کێ دەگونجێ چونکە زۆر کێشە هەنە کە نابێتە هۆی تێك چوونی هاوسەرگیری چونکە تێك چوونی هاوسەرگیری کارێکی زۆر خراپ لە دوای خۆی دەهێنێ وە زۆربەی هۆکارەکان تێك چونی خێزان لەبەر هاوسەرگیریەکەیە کە لە سەرەتاوە لە یەك تێنەگیشتنێك هەبووە وە شارەزای یەکتر نەبوونە بۆیە من پێم باش نیە کە هاوسەرگیری بێ یەکتر دیتن و بێ قسەکردن وە بێ لە یەك تێنەگیشتنێك هەبێ هاوسەرگیری بکرێ چونکە کێشەی زۆر دەنێتەوە لە دوای خۆی بەراستی ئەمەش کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا و وڵات دەبێت چونکە رێژەی تەڵاق دان زۆر دەبێت وە کێشەی خێزانی زۆر دەبێت وە زۆر منداڵی بێ تاوان بەبێ دایك و باب دەمێنەوە بەراستی دەبێت ئێمە باش بیر بکەینەوە کە ئایا ژیان چ جۆرە مرۆڤێکی لەگەڵ دەگونجێ وە دەبێت شارەزیەکی باش هەبێت چونکە ئەگەر بێت و کوێرانە هەڵسوکەوت بکەی زیانێکی زۆر دەگەیەنێ لەوانەیە توشی زۆر کێشە بیەوە کە کێشەکان ببێتە هۆی دابرادن وە کێشەی خێزانی بکەوێتەوە بەراستی کاریگەرە ئەگەر مرۆڤەکان نەزانن چۆنن مامەڵە لەگەڵ هاوسەرگیری و خێزانیان دا بکەن هەم پیاو هەم ژن چونکە هەردووکیان کاریگەر دەبن لەسەر خێزان پێك هێنان وە نەوەی دوارۆژ

پێك بهێنن وە نەوەیەکی کە خاوەن زانست و رۆشنبیری کە ئەم نەوە چارەنووسی وڵاتەکەی دیاری بکات هەردەم ببتە خێر و خۆشی بۆیان هەردەم پاداشتی خەناوادەکەی بداتەوە کە ئەویان گەیاندۆتە ئەم رۆژە ئێمەی مرۆڤیش پێویستمان پێیە کە نەوەیەکی ئەوجۆرەمان هەبێت بۆ دوارۆژ کە دەبێتە سەر بەرزی بۆ هەموو خەڵکی ئەم وڵاتە ژیانمان هەردەم خۆشتر دەبێت کە ئێمە تیادا دەروانین ، ئەمە راستی هاوسەرگیریە وە ئەمەش راستی ژیانە کە دەبێ بیزانین چونکە هاوسەرگیری وەك جلوبەرگ وا نییە کە هەر کاتێك کۆن بوو بە ویستی خۆت فرەبدە.

# ٥- ژیانی بێچارەیی

بڕۆ بۆ جێگەیەکی دوور دوور، بڕۆ بۆ جێگەیەکی دوور دوور، هەموو کەسێك و هەموو شتێك پشتگوێ بخە، ئیتر نە لە کەس دەڕەنجێی و نە عاشقی هیچ کەسێکیش دەبیت..!

ژیانی بێچارە وەك ئەوە وایە کە ژیانێکی بێکەس بێت زۆربەی مرۆڤەکان کێشەی ئەوەیان هەیە دڵی خەڵك نەڕەنجێنی دەبێ دووربی لە خەڵك ئەگەر بتەوێ عاشق نەبی دەبێ دوور بی لە خەڵك ژیانێکی بێچارەیە، بۆیە دەبێ مرۆڤەکان لەگەڵ هەستی خۆیان زۆر بەهێز بن چونکە هەستەکان زۆر بەهێزن دەبێ بتوانی هەستی خۆت ڕاگری ژیان پێویستی بە کەسانی بەهێزە وەك کەسانێك کە لەسەر هێزی هەستەکانی زاڵ بێ ژیانێك نەبێ، وە بێچارە بێ لە ژیان هەردەم دەبێ بەردەوام بی زۆر کەس دەڵێ: حەز دەکەم بمرم!!! هەڵەی ئەی مرۆڤ تۆ خۆت بۆچی بێزار دەکەی، هەردەم بەهێزبە چونکە ژیانی ڕاستی پێویستی بە مرۆڤی ڕاستە کە بتوانێ کە بتوانێ لە ژیانی بژی بە خۆشی و ناخۆشی دەبێ ئێمە سوپاسی خودا بکەین ژیان هەردەم دەبێ بەردەوام بێ لە ژیان چونکە خودا بە هەموو جۆرێك تاقیت دەکاتەوە کە بزانی سوپاس گوزاری بە بەست، بۆیە لە ژیاندا دەبێ بژی تا ئەو کاتەی خودا بۆ خۆتی دەباتەوە ەوجا کە کارەکانت چۆن بووە تۆ دەبێ کرداری چاکەت کردبێ تا بتوانی شتی باش بە دەست بێنی چونکە ئەم دونیا جیاوازە

لەگەڵ ئەو دونیایە، ئەو دونیایە تەواوە تۆ بۆ خۆت لەوێی جارێکی تر ناژیەوە ژیان لەوێ بەردەوامە ئەی مرۆڤ ئەوە ڕاستی ژیانە ئەی مرۆڤ.

هەژار ئەگەر ئازا بوو، پێی دەڵێن هەڕەشە و خوێڕییە، ئەگەر بەخشندە بوو، پێی دەڵێن دەستبڵاوە بۆیە هەژارە، ئەگەر هێمن بوو، پێی دەڵێن زەبوون و داماوە، ئەگەر ڕێزی خۆی گرت، پێی دەڵێن گەوج و نەزکانە..! ئەمەش بۆتە ژیانی ئێمە کە هەردەم نازانین چی بکەین وە بۆ خۆمان بێ چارە دەژین وە کەس هەست بە ژیانی ئەوی تر ناکات وە هەردەم گلەیی مرۆڤەکان تەواو نابێت وە چاوەڕێی شتێکی خراپی تۆ دەکەن تا بتوانن ڕەخنەیەکت لێ بدۆزنەوە تا بتوانن قسەت پێ بڵێنەوە وە هیچ کات عەیب لە خۆیان نابینین تەنها لە کەسانی تر دەبینەوە ئەمە مرۆڤایەتی نییە ئەمانە مرۆڤایەتیشیان هێناوەتە خوارەوە تا یەك هەبێ لە تۆ نابێ عەیب لە خەڵکی تر ببینیەوە، بۆ نموونە: ڕۆژێك ژنێك کوڕی خۆی دەباتە لای گاندی پێی دەڵێ: کوڕەکەم زۆر شەکر دەخوات پێی بڵێ با کەی بکات، گاندی دەڵێ: بڕۆ یەك هەفتەی تر وەرەوە، پاش یەك هەفتە دێتەوە کوڕەکەی خۆی هێناوە ئەوجا بە منداڵەکە دەڵێ: کوڕی خۆم زۆر شەکر مەخۆ زۆر شەکر خواردن خراپە، ژنەکە دەڵێ: بۆ جاری یەکەم پێت نەوت؟ لە وەڵامدا گاندی دەڵێ: چونکە منیش شەکرم زۆر دەخوارد منیش کەمم کردەوە ئەوجا بە منداڵەکەم تا یەك عەیبم هەبێ ئەو عەیبە ناڵێمە خەڵك بۆ تۆ ئەم عەیبەت هەیە.

کەچی مرۆڤەکانی ئێستا هەمیشە گلەیی لە خەڵك دەکەن وە هەردەم عەیبی لە خەڵك دەبینیەوە وەك شاعێرێك دەڵێ:

یەك عەیبی خۆت ئەبینی خۆت ساحبی هەزاری
خلّکت لەلا غەرارە خۆشت وەکو دەواری

ژیانێکی بێچارەیە هەردەم خەم بۆ ئەو ژیانە دەخۆین نەك لەبەر خۆم تەنها لەبەر قسەی خەڵك چونکە قسەی خەڵك زۆر کاریگەرە لەسەر مرۆڤ تایبەت ئەگەر ڕقیان لێبێت قسەی نا دروست دەکەن ئەمەش ڕەوشتی مرۆڤایەتی نییە مرۆڤی ڕاستی هەردەم دوورە لەو شتانە تا شتێك بە چاوی خۆی نەبینی نایڵێ، هەروەکو نیچە دەڵێ: سەیرە ئەوانەی گۆزە دروست دەکەن، خۆیان لە گۆزەی شکاودا ئاو دەخۆنەوە، ئەوەیە کە مرۆڤەکان دەیانەوێ شتەکانی خەڵك چاك بکەنەوە کەچی بەخۆیان لە ژیانێکی پڕ لە ناخۆشی دەژین وە عەیبیان زۆرە، مرۆڤەکان لە ژیانێکی وا تێپەڕ دەبن کە هەموو کات هیوا بۆ نەبوونی دەخوازین تەنها لەبەر خۆیان نا لەبەر دەوروبەری. بۆ خۆیان ناگۆڕن ئینجا خەڵکی ت بگۆڕن بۆ مێشکی خۆیان نەگۆڕن ئەوجا مێشکی خەڵکی تر بگۆڕن ئەمە کار ڕاستی ژیانە کە خۆمان لە ژیانێك بژین کە هەموو لەشمان بە عەیب داپۆشراوە کەچی ئامۆژگاری خەڵك بکەین وە عەیب لە خەڵك بدۆزینەوە ئەمە ڕاستی ژیان نییە بەڵکو ژیانێکی بێ چارەیە وە ڕاستەکانت

شاردۆتەوە کەچی مرۆڤەکان هەردەم خۆیان پێ باشترە لە کەسانی تر لە ڕاستیدا مرۆڤ دەبێ هەمیشە هەوڵ بۆ باشتر بوونی خۆی بکاو ژیانێکی پڕ لە خۆشیدا بژی نەك لە ژیانێکی بێچارە، ڕاستیەکانی خۆتان بزانن پێش ئەوەی کەسێکی تر بێ بەها بکەن، هەروەك (سوقرات) دەڵێ: خۆت خۆت بناسە تاوەکو نەتوانی عەیب لە خەڵکی تر بگری دەبێت خۆت عەیبەکانی خۆت بدۆزیتەوە و نەیان هێلی، ئەوجا عەیب لە خەڵکانی تر بدۆزەرەوە هەروەکو چۆن (دکتۆر علی شەریعەت) دەڵێ:

ویـــستـــــــم بژیـــــم ... ڕێگایـــــــان لێ داخستـــــــم

خودا پەرستیـــم کرد ... ووتیـــان خەریـکی خورافـــاتیە

عـــــــاشق بـــــــووم ... گوتیـــــــان درۆیـــــــە

گریـــــــــام...گوتیـــــان بەهانـــــــە دەهێنییێتـــەوە

پێکـــــەنیـــم ... وتیـــان جنۆکـــە دەستـــی لێ وەشـاندوە

ژیـــــــان بووەستـــــــە مـــــن دا ئـەبـــــــــەزم...

ئەمە بۆتە ژیان کە خەڵك وات پێ بلێن ژیانتان لێ تاڵ کردوین تا کەی وامان لێ دەکەن وا بژین بێزارمان مەکەن چونکە وادەکەن کە خۆمان بکوژین ئیتر بۆ وادەکەن خۆشی ژیانمان لێ تێك دەدەن وە بێزارمان دەکەن ژینی خۆمان با بەخۆمان بکەین کەس نێتە ناو ژیانمان، ژیانمان لێ تاڵ بکات ئێمە هەر چۆنێك بژین با بژین با بزانین واتای ئازادی چییە

با هیچ مرۆڤ بەسەر هیچ مرۆڤ زاڵ نەبێت چونکە ژینی ئێمە زۆر خۆشترە کە ئێوە تێدا دەژین و پێ دەکەنین ئێوە ناڕازین ئەگەرین ئێوە ناڕازین دەمویست بژیم ژیانێکی سادە و خۆشم ویست بە تەواوی بژیم ڕێگاتان لێ داخستم وە ژیانتان لە پێش چاو ڕەش کردم هەتا کەی وازم لێ ناهێنن تا بتوانم بۆ خۆم بژیم قسەی ئێوە ئەوەندە زۆرە نازانم چی بکەم خودایا زۆر سوپاس بە بەست بەڵام بەو کەسانە بڵێ کە من چۆنم با وابم نەك بە قسەی وان بکەم وە هەردەم ژیانم لێ تێك دەدەن وە ڕاستی ژیان نازانن، مرۆڤمان هەیە تەنها ژیانی لە مردوێك خۆشترە وە پێیەکی لەو لایە پێیەکی تری لەلاکەی ترە، هیوا بۆ مردنیش دەخوازی چونکە لەبەر قسە و ڕەخنەی خەڵك ناتوانێ هیچ بکات، وە خەمەکمان هەیە ئەویش قسەی خەڵکە وە قەت نابڕێتەوە، مرۆڤەکان هەردەم بەردەوام بن لەسەر ژیان وامەکەن ئەوان کارتان لێ بکەن وە ژیانی بێچارەیی زۆربەی کات بۆ ئەو کەسانەیە کە هەژارن چونکە هیچیان نیە بۆی بژین وە هەردەم چاوەڕێی شتێك دەکەن کە خەڵك بەهانایان بچێ ئەمە ڕاستی ژیانی بێ چارەیە، مرۆڤی هەژار ئاوات خواز دەبێت بۆ ژیانێك کە مرۆڤی ئاسایی هەیتی نەك ئەگەر یەك ڕۆژ ئیش ناکات ناتوانێ بژی ئەمە ژیانی بی چارەیە چونکە هیچ شتێك نیە بۆی بژی وە لە هەمان کات زۆربەی کات ماندووە وە ژیانێکی پڕ لە ناخۆشی دەباتە سەر وە هەردەم کەسێکە کە خاوەن مرۆڤایەتێیەکی هەژارە وە لە ناخیدا زۆر شت هەیە بەڵام ناتوانن بی گۆڕن بۆیە زۆربەی کات هەر دەڵێن ئێمە بۆچی دەژین کاتێك کە هیچمان نیە بیخۆین کە منداڵەکانی داوای شتێکی لێ دەکەن دەڵێ با

هەندێك ئیش بكەم ئەوجا دڵی منداڵەكانی دەداتەوە وە هەمیشە دەگرییَ لە ناخەوە ناتوانیَ كە منداڵەكانی حەزیان لە چییە بۆیان بكڕیَ وە خەم دەخوات كە ژیانێكی بێچارەیی دەباتە سەر ئەمە ئەبێتە هۆی نەبوونی ژیان، ئێمە هەمیشە سەیری لە سەرووی خۆمان خۆمان دەكەین، بەڵام جارێك سەیری خوارووی خۆمان ناكەین كە چەند لە ئازار و خەمدا دەژین، ئەوان هەولَ دەدەن باشتر بژین بەڵام ناتوانن چونكە هیچیان نیە لە دەستیان كە بیكەن.

ئەمەیە ڕاستی ژیان، هەر كەسێك ئەگەر پێگەیشت وە بوو بە خاوەن هێز و دەسەڵات ئەوا هەموو نەهامەتیەكانی خۆی لەبیر دەكا نازانێت كە ئەویش ڕۆژێك لە ناخۆشیدا ژیاوە، با یارمەتی فەقیر و نەداران بدا با لەو ژیانە سەختەدا ڕزگاریان بكا، هەر كەسێك بگاتە شوێنێك تەواو ئیتر خەڵكەكانی تر لەبیر دەكات یان ئەو كەسانە زۆرن كە بۆ ئیشی خۆیان لەگەڵتن دوای ئەوە لە كوێن وون دەبن وە ژیانی خۆیان خۆش دەكەن و دوایی بەجێت دێڵن وە لە هەندێك كاتدا سەلامیشت لیَ ناكات، ئەمەش لە ژیانی بێ دەچێت ژیان زۆر زەحمەتە بەڵام هەر بەردەوامە بەڵام تەنها جیاوازی ئێمە ئەوەیە كە هەمیشە ورەی خۆمان بۆ ئەوانی تر نادۆڕێنین وە شەڕەفی خۆمان نادۆڕێنین ئەمەش گەورەترین بردنەوەیە لە ئاستی مرۆڤیەوە هەردەم ژیانێكی پڕ لە خۆشی ببە سەریَ بەڵام تەنها بۆ خۆمان دەبێ هەولَ بدەین هەرگیز كۆلَ نەدە نەك چاوەڕیَ بكەین یەكێكی تر هاوكاریمان بكات ژیانی خۆمان بۆ خۆمان خۆش دەكەین بەپیَ تواناكانمان پێویستمان بە كەسانی تر نیە وە هەمیشە هەست بە

خۆشیەکی زۆر بکەین بۆ ئەوانەی کە بە دەستمان هێناوە، بەڵام هەندێك کەس هەن لەبەر خەمەکانیان ژیانیان گۆڕاوە، وەئەگەر کارەکیان سەرکەوتوو نەبوو ئەوا بەیەك جاری دەروخێن پەنا دەبەنە بەر شتی ناشیاو ئەمەش دەبێتە هۆی لەناو بردنی خۆیان مرۆڤ تۆ زۆر گەورەتری وەك لەوەی شتێك کارت تێ بکا.

ژیانێکی بێچارەیە ئەمەش خەمە بۆ مرۆڤەکان وە هەردەم دەستی خۆیان بۆ کەسانی تر بکەنەوە چۆن وادەکەن کە کەسانی تر لەبەر خەڵك بپاڕێنەوە تا هەندێك پارەی بداتێ تا دڵی منداڵەکانی خۆشبکات وە ژیانێکی بێ چارەیی بباتە سەر مرۆڤایەتی ئاوانییە کە من شتێکم هەبێ کەسێکی تر نەیبێ وە پێغەمبەر محمد درودی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ:﴿لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه﴾، واتە ئێوە بڕوادار نابن ئەگەر ئەوەی بۆ خۆتان پێ خۆشە بۆ برا موسڵمانەکەشتان پێ خۆش نابێت. با بە پێی تواناکانمان یارمەتی یەکتر بدەین با کەس هەست بە کەمی نەکا لەم ژیانە، ئەڵێن بەیانی هەموو شتێك باش ئەبێت، ئەی باشە ئەمڕۆ بەیانی دوێنێ نییە؟؟ هەندێك کەس هەن هەر دەڵێن بەیانی باش دەبێت بۆ هەموو شتێك باشە بۆ ئەمڕۆ هەوڵ نادەی ئەی ئەمڕۆ بەیانی دوێنێ نییە با ئەمڕۆ کارەکانی خۆمان بکەین دوا نەیخەین بۆ سبەی تا بتوانین لە ژیانی بێچارەیی ڕزگاربین نەك بۆ بەیانی چونکە بە دڵنیاییەوە بەیانیش دەڵێی دوو بەیانی کەواتە تۆ هیچت نەکرد، ژیانی خۆت لە دەست خۆتە تۆ هەوڵبدە هەموو کارێك بکەی تا ڕزگار بی لەو کێشەیەی کە هەیتت تا بتوانی لە

ژیانێکی لە خۆشدا بژی نەك لە ژیانێکی بێچارەیی مرۆڤەکان ژیان لە دەست ئێوە دایە بەخۆتان شتەکان باشتر بکەن نەکلە ڕووی کاتەوە چونکە کاتەکان شتەکان خراپتر دەکات خۆتان بەرپرسن لە ژیانتان، ژیانی بێچارەیی بیکە بە ژیانێکی خۆش گوزاری ئەمەیە ڕاستی ژیان، مرۆڤی بێچارە هەردەم دەرفەتێك هەیە کە بۆ ئەوەی سەرکەون ئەمە ڕاستی مرۆڤی بێچارەیە وە ڕاستی ژیانە.

# ٦- توانای مرۆڤ

کاتێك کە بڕیار دەدەیت لە دژی ستەم بوەستیتەوە، بێگومان دەبێت پێشبینی ئەوەش بکەیت کە گووتەی نەشیاو و جنێوی زۆرت پێبدرێت، وە پاشان بە خۆفرۆش لەقەڵەم بدرێیت، بەڵام هەرگیز نەکەیت بێدەنگ بیت لە ئاست ستەمدا تەنها لەبەرئەوەی پێت بڵێن تۆ پیاوی ئاشتیت.. !

توانای مرۆڤ یەکەکە لە هەرە بابەتە چرینگەکان مرۆڤ دەبێ بە توانابێ لە هەموو کات پێویستی بە کەس نابێ کە پشگیری بکا بەلکو با بە خۆی هەوڵ بدات بۆ پێشەوە بەرەو ئەو شتەی کە خۆی دەیەوێ بەڵام دەبێ خۆشی بۆ هەموو شتێك ئامەدە بکات تا ئەو بەربەستەی کە دێتە پێشی بتوانێ لەسەری زاڵ بێ مرۆڤـ پێویستو هەردەم داوای ماف خۆی بکات کە هەیەتی وە بێ دەنگ نەوون لە مافەکەی چونکە بێ دەنگی لە مافەکەی واتە رازی بوون بە مافاکەی ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ کە ماف لێ دەخورێ وە پشگیری لە ماف ناکات مرۆڤەکان ئێوە دەتوانن هەموو شتێك بکەن تا ماف خۆتان بە دەست دێنن بەڵام تنها با توانای خۆتان نەك پارە و دەسەلاتی گورگەکان بەکاربێنن چونکە مرۆڤ زۆر لە وە بەتواناترە کە خۆمان تێیدا دەبینین مرۆڤ کەسێکی بە هێزە کەسێکی ژیرە بەڵام ئێمە تا ئێستا نەمان توانیوە بیسلمێنین بۆیە دەلێم وە دەلێمەوە مرۆڤ زۆر بەتواناترە کە خۆی بیری لێدەکاتەوە ژیانی راستی لە مرۆڤوکانە لە توانای مرۆڤیە مرۆڤی بە هێز هەردەم بەردەوامە هەر چەند شکست بخوا، باشترەلەسەر قاچەکانم بمرم نەك لەسەر ئەژنۆ

بژیم وه کەوتنی مرۆڤ شکست نیه بەڵکو شکست ئەوەیه که لەو جێگەیه بمێنێتەوه که لێوەی کەوتوی، ژیانی راستی پێویستی به مرۆڤی به توانایه نەك له روی جەسته بەڵکو له رووی مێشکەوەش چونکه مرۆڤی زیرەك هەردەم دەباتەوه ئەوەیه راستی ژیــان .کاتێك یوسف له لایەن براکانییەوه دەخرایه نێو بیره ئاوەکه یوسف زەردەخەنەیەکی کرد یەکێك له براکانی گوتی ئەوه بۆ پێدەکەنی؟ ئێره خۆ شوێنی پێکەنین نییه یوسف له وەڵامدا گوتی ڕۆژێك بیرم دەکردەوه که چۆن کەسێك دەتوانێت دوژمنایەتی من بکات له کاتێکدا من ئەو هەموو برا بەهێزەم هەیه بەڵام خودا هەر ئەو برایانەی خۆمی کرده دوژمنم تا تێبگەم که ناتوانم پشت به هیچ بەندەیەك ببەستم .برادەر...به هەبوونی ئیرادەی بەهێز دەبیته خاوەنی هەموو شتێك !...مرۆڤەکان وەك هاورێیەك قسه دەکەم به هەبوونی ئیرادەی بەهێز دەتوانن هەموو شتێك بکەن چونکه هەوڵی بۆ دەدەن وه بەردەوام دەبن لەسەر کارەکان هەردەم تۆ حەز دەکەی بەردەوام بی چونکه به ئیرادەیەکی به هێزەوه چویته ناو کێشەکانەوه یان کارەکان چونکه بەراستی به ئیرادەی به هێز دەتوانی بگەیه ئەو شتەی که تۆ دەتەوێ هەردام دەیلێم و دیەڵێمەوه مرۆڤ هەردەم بەتوانایه به ئیردەی به هێز بەڵام ئەگەر ئیرادەی به هێزی نەبوو ئەوه ناگایته ئەو شتەی که خۆت دەتەوێ چونکه بەراستی هەموو مرۆڤێك پێویستی به ئیرادەی به هێزه چونکه پێویستی بەو شتەیه که دەیەوێت مرۆڤەکان خۆتان بزانن که به ئیرادەی به هێز دەتوانن هەموو کارێکی گران ئاسانی بکەن چونکه بەراستی پێویستمان به ئیرادەیەکی

بە هێز هەیە، نمونەیەك: لە راستی دا من مرۆڤێکم بینی کە ئیرادەیەکی بە هێزی هەبوو وە لە هەمان کات مرۆڤێکی ترم دیت بێ ئیرادە هاتبوو پرسیم کامتان حەزتان لەم ئیشەیە بیکەن ئەو کەسەی ئیرادەکی بە هێزی هەبوو وتی زۆر حەز دەکەم ئەم کارە بکەم وە پر بە دڵیەوە ئەم قسانەی دەکرد بە دەم بەخەندە بەڵام ئەوەی بە بێ ئیرادە هاتبوو وتی ئەگەر ئەم ئیشە نەبێتن لە ماڵ دادەنیشم، کەواتە ژیانیش ئیرادەی خۆی هەیە توانای مرۆڤ پێوەستە بە ئیرادەیەکی بە هێز .من و تۆ : ئەگەر تۆ بتگوتایە ناتوانم دەمگوت هەوڵبدە ئەگەر بتگوتایە نازانم دەمگوت فێرببە ئەگەر بتگوتایە مەحاڵ و نا مومکینە دەمگوت تاقی بکەرەوە .

مرۆڤەکان هەردەم توانای خۆیان پشگوێ خستووە هەردەم دەڵێن مەحاڵە ئێمە بتوانین مرۆڤەکان هەردەم هەولی بۆ بدەن تاقی بکەنەوە چونکە هیچ شتێك مەحاڵ نیە بۆ ئێوە مرۆڤەکان توانای ئێوە زۆر بە هێزترە وە هیچ کات مەڵێن ناتوانین هەوڵ بۆ بدە تا بتوانی سەرکەوی تا بتوانی خۆشیەکانی خۆت ب بینی بە چاوی خۆتان بی بینن بەس هەموو کات بە خۆتان بزانن کە ئێوە توانایەکی بیرلێنەکەراوتان هەیە مرۆڤەکان هەردەم بتوانن توانای خۆتان بناسن، ئەگەر بێت و لە شتێکتان نەزانی ئەوا پرسیار بکەن تا فێربن چونکە دەتوانین خۆمان فێر بین وە توانای خۆمان بەدەربێخین وە پرسیار کردن هیچ کات عەیب نیە نەزانین عەیبە مرۆڤەکان بەردەوام بن تا بتوانن زیاتر فێر بن تا بتوانن توانای خۆتان بزانن، لە ژیان دا هەمیشە مرۆڤی بە توانای دەوێت تا بتوانین هەموو کارێکی رۆژانی خۆتان بکەن وە بگەیتە ئامانجی خۆت تا بتوانی ژیانێکی

پر لە خۆشی ببەیتە سەر بەڵام بتوانی خۆت بەو توانایی کە خۆت حەزت لێیە نەك مرۆڤی تر، جۆرە مرۆڤێك هەن تەنها خەم دەخۆن کە وا دەزانن توانای مرۆڤایەتیان نەماوە واتە وا هەست دەکەن تەنها ژیانیان لە مردوێك باشترە ئێوە هەڵەن مرۆڤەکان چونکە توانای مرۆڤ هەردەم زیاد دەکات وە بە هێزتریش دەبیت تەنها بۆ خۆتان بیزانن مرۆڤەکان توانای ئێوە زۆر زیاترە کە خۆتان بیری لێدەکەنەوە مرۆڤی بە هێز تونای بە هێز مێشکی بەهێز دەتوانێت بە ئیرادەیەکی بەهێز هەموو ئەو کارانە بکات کە خۆی دەیەوێ تۆ هەردەم بە هێزی خۆت کارەکانی خۆت بکە نەك بە هێزەکی تر کە کەسێکی تر بەکاربێنی بۆ کارەکانت هەرکەسەو بە کاری خۆی و بە توانای خۆی کاربکات زۆر باشتر کارەکە ئەنجام دەدرێ، مرۆڤەکان ئەمە راستی توانای مرۆڤیە خۆشتان توانای خۆتان بزانن وە بیزانن کە ئێوە چەند بتوانن بە ئیرادەی بەهێز بە توانای خۆتان بە مێشکی بەهێز دەبنە خاوەن ئەو مەبەستەی کە خۆتان دەتانەوێت ئەمەیە راستی مرۆڤیەتی وە راستی توانای مرۆڤایەتی.

## ٧- باوك

پیاو

هەنـدێ جـار لە ژنێك زیاتر

پێویستی بە تێگەیشتن و

خۆشەویسـتی هەیە

باوەر ناکەیـی ؟ !

دەنگێکم بۆ بێنە غەمگینتربێ لە گریانی پیاو ؟ !

باوك کەسێکە کە زۆر کار دەکات بۆ منداڵاکانی کە تا منداڵەکانی نەکەونە ژێر دەستی هیچ کەسێك وە هانای بۆ کەس نەبات وە ئەگەر سەیری دەستی باوکمان بکەین دەبینین چەند ئازاری چەشتوە تا گەیشتیتە ئەمرۆ وە ئێمە هەست بە ماندوو بونیان ناکاین وە ئێمە لە ناخیوە هەستی پێ ناکەین کە ئەوان چیان بۆ ئێمە کردوە ئێمە زۆربەی کات هەر گلەیی دەکەین کە هیچیان بۆ ئێمە نە کردووە ژیانەك ئەگەر باوکی تێدا نەبێ واتە لە هەستی باوکیتی نازانی وە سۆزی باوکایەتی نازانی هەردەم باوکتان خۆشبوێ هەردەم سوپاسی بکەن هەردەم هاورێبن لەگەل باوکتان هەردەم شانازی بە باوکتان بکەن نەك بلێن باوکمان هیچی نە کردووە باوکتان نانتان بۆ پەیدا دەکات هەر باوکتانە هەموو شتێك دەکات بۆ ئێوە بۆئەوەی ژیانتان ئاسودە بکات ژیانێکی پر لە خۆشی و میهرەبانی پێتان دەبەخشێ ژیانێك قەدری باوکایەتی تێدا نەبێ ئەوە زۆر دورە لە مرۆڤایاتی وە لە راستی ژیان زۆر بەی کات

هەست بە دڵ گرانی دەکەی مرۆڤ دەبیٚ ئەم راستیە بزانیٚ کە باوك زۆر بەی کات هەمووشت بۆ منداڵاکانی دەکات وە لە پێناویان دا هەموو شت دەکات وە چارە نوسی بۆ منداڵاکانی دیاری دەکات تا لەسەر هێز بیٚ ئیش دەکات تا بتوانیٚ خواردنێك بۆ ماڵەکەی بێنێتەوە تا ژیانیان ئاسودە بکات ژیانێك کە پر لە نا خۆشی بینیوە، بۆ منداڵاکانی پر لە خۆشی بیٚ ئەی مرۆڤ راستی باوکت بزانە بزانە تۆ چەند بیٚ ئاگای لە باوکت کە ژیانێکی پر لە نا خۆشی هەڵ مژیوە تا تۆی گەیاندۆتە ئەم شوێنەی کە تۆ ئێستا تیادا دەژی، تا باوکیشمان لە دەست نەدەین نازانین قەدری چەندە، ئەویە راستی باوك وە راستت ژیان .هــەمیشە باوك ئـامادەیە بە جلێکی چڵکن و خۆڵلاویەوە بە بـیٚ شـەرم کردن بڕوات کار بکات تا نانێکی حــەڵاڵ بۆ منــاڵاکانی بە دەسـت بهێنـیٚ ...؟؟؟ بـەڵام منـاڵاکـانی ڕوویان نـایەت لای هـاوڕێکانی بڵێن ئـەوە باوکـمـانە...!! هەندێك مرۆڤ هەن کە باوکیان دەبینن لەسەر کارە هاورێکانی کە خۆی هەڵدەکێشیٚ ئەو کات کە باوکی ئیش دەکات نانێك بۆ منداڵاکانی پەیدادەکات ئەو کات منداڵاکانی پێیان شەرمە بڵێن ئەوە باوکمانە کە باوکیان ئازار دەکێشیٚ تا منداڵاکانی خۆی موحتاجی کەس نەبن تا دەستیان بۆ کەس نەبەن کە چی منداڵاکانی دەڵێن ئەوە کەی باوکە هیچمان بۆ ناکات باوکی خەڵکی هەموو شتێك بۆ منداڵاکەی دەکات بەڵام باوکی ئێمە نەبێت، مرۆڤەکان هیچ کات وا مەڵێن چونکە باوکتان ئەوەی لە توانای دابیٚ بۆتان دەکات ئەوەی بتوانیٚ دەیکات ئەگەر باوکتان نەبوایە ئێوەش نەتان دەتوانی ئەوها بژین کە نەخۆش

دەکەوین باوکمان دەمان بات بۆ نەخۆشخانە هەموو ئیشێك دەکات تا دەرمانی تۆ بکرێ تا بتوانێ نەخۆشی تۆ چارەسەر بکات ئامادەیە هەموو شتێك بۆ تۆ بکات بەلاّم لە کاتێك دا کە نەتوانی لە وە زیاتر بکات تۆ چیت دەوێت مرۆڤەکان ئێوە تەنها وەفای بۆ باوکتان هەڵنەگرن بۆ کێ هەلدەگرن باوکتان ئێوەی زۆر خۆشدەوێت وە ئامادەیە هەموو شتێکتان بۆ بکات ئیترمرۆڤەکان ئێوە لە ئەمە زیاتر چیتان دەوێ خۆتان بە چاوی خۆتان ب بینن کە باوکتان کاتێك کە ئیش دەکات زیاترلە بەر کێ ئیش دەکات؟ زیاتر بۆ ئێوە تا ئێوە دڵخۆش بکات کە چی ئێمەش نارازین لەبرامبەر باوکمان کە ئەو هەموو شتێك دەکات بۆ ئێمە، باوکمان هەمیشە تا یەك دەقە لە تاقەت دابێ بۆ منداڵاکانی کاردەکات دەکات هەردەم بە پارەی خۆی خەرجیتان بۆ دەکات، بۆ ئێوە هەموو شتێك دەکات بەلاّم ئەگەر لە توانای دانەبوو چیبکات مرۆڤکان ئێوە زۆر هەڵەدەکەن لەبرامبەر باوکتان دڵی مەشکێنن هەردەم دڵی خۆش بکەن هەردەم باوکتان دڵی بە ئێوە خۆشە دەیەوێ بە باشترین شێوە وەسفتان بکات هەردەم ژیانی خۆی بۆ ئێوە دادەنێ وە بۆ نەوەکانتان کە شانازی بکەن کە باپیرە گەورەیان پیاوێك بووە هەردەم خۆشەویستی منداڵاکانی خۆی ئیشی کردووە وە کاری باشی کردووە رەوشت بەرزی فێری منداڵاکانی کردووە ئەمە ژیانە واتە خۆشەویستی باوکتان بۆ ئێوە ئاخ مرۆڤەکان دلی باوکتان مەرەنجێنن باوکتان هەردەم ئێوەی خۆشدەوێت هەردەم گیانی خۆی بۆ ئێوە بەخت دەکات تا ئێوە ژیانێکی خۆش ب بەنە سەر ئەگەر باوەر ناکەی تاقی

بکەوە ئەو کاتی بووی بە باوك یان دایك بزانە چەند منداڵەکەت خۆشدەوێت زیاتر لە هەموو کەس منداڵەکەت خۆشدەوێت خۆشەویستی تو هەردەم بۆ منداڵەکەت دەبێت ئینجا بزانە خۆشەویستی باوکت بۆ تۆ چەند بووە منداڵێك کە هەر لە بچوکیەوە باوکی بۆ ئەو ئیش دەکات هەموو ئازارێك دەبینی بۆ ئەوەی منداڵاکای خۆی دڵخۆش بێت چۆن ئێمەش ئەم چاکەیە لەبیر بکەین مرۆزەکان هەردەم خۆشەویستی باوکتان لە ناو دڵ دابێت نەك قسەی رەق یان بڵێین باوکمان هیچی بۆ ئێمە نەکردووە دلنیا بن مرۆڤەکان باوکتان ئەوەی لە توانای دابێت دەیکات هەردەم ئیشدەکات بۆ ئێوە تا بتوانێ بژێوی ژیان پەیدا بکات تا منداڵاکانی برسی نەبن و منداڵاکانی نەخۆش نەکەون بۆ دڵ خۆشکردنی منداڵاکانی خۆی هەموو شتێك دەکات مرۆڤەکان ئێوەش تێبگەن کە باوکتان هەردەم بۆ ئێوە هەوڵ دەدات نەك بۆ خۆی چونکە ئەگەر تەنها بۆ بژێوی ژیانی خۆی با ئەوە زۆر خۆی ماندوو نەدەکرد بۆ خۆشی خۆی هەردەم بە پارەیەکی کەم ئیشی دەکرد خەمی نە دەخوارد بەڵام زیاتر بۆ ئێوە ئیش دەکات زۆر خۆ ماندوو دەکات تا بتوانێ ئێوە بەرێوەبەرێ تا بتوانێ ژیانتان بۆ دابین بکات تا ژیانێکی لە خۆشیدا بژی وە دەیەوێت پارەیەکی زۆر دابین بکات تا داهاتوی ئێوە بنیات بنێ تا بتوانێ دڵخۆشتان بکات چونکە بۆ ئەو دڵخۆشی ئێوە بۆ ئەو هەموو شتێکە وە خەم بۆ ئێوە دەخوات ئایە لە هیچیان کەم نیە ئەیا دەبێت سەلامت بێت ئایە دەبێت پارەی پێبێت زۆر خەم بۆ منداڵاکانی دەخوات ئێمەی مرۆڤیش هەردەم نارازین بەرامبەر بە

باوکمان هەردام دەبێت بلێین باوکە لێمان خۆشبە ئەگەر تۆمان ئەزیەت دابێت وە سوپاس گوزار بین بە خودا کە باوکێکی وای داوەتەوە بە ئێمە چونکە باوك زۆر ئەزیزە لەلای مرۆڤەکان تا نەروات قەدری نازانین، مرۆڤەکان ئەمە راستی ژیانە وە ئەمە راستی باوکە ئیتر خۆتان بزانن کە باوکتان چەندە بۆ تۆ خۆشەویستە باوك لە ژیان دا پێویستە بۆیە با لە ژیانی ئەو دا دلخۆشی کەین تا ماوین سوپاس گوزاری لەبرامبەر بە ئەو بکەین راستی باوکتان بزانن چونکە باوکتان هەموو شتێکە راستی باوکتان ئەمەیە مرۆڤەکان .هەتا ڕوخسارس باوکێکی هەژار نەبینی، نازانی باوکایەتی چەند گەورەیە چونکە مرۆڤەکان لە هەژاری دەست پێبکەن دەتوانن بزانن کە باوکیان چەند خۆشدەوێت چونکە باوکی هەژار هەموو شتێك دەکات بۆ منداڵەکانی ئەمەیە راستی باواکایەتی کە لە باوکی هەژارەوە دەیزانین چونکە باوکی هەژار هەردەم لە پێناو خێزانی خۆی هەموو شتێك دەکات هەموو کاتەکیش بەردەوام ئیش دەکات تا بتوانێ بژێوی ژیانی خۆیان پەیدا بکات ئەمە راستی باوکتانە.

## ٨- خۆشی و ناخۆشی

خۆشی ژیان بەشێکی گرینگە کە لە رووی ژیان، دەبێ تۆ هەموو کات دڵ خۆشبی؟؟؟ وە بۆ؟؟؟ ئەگەر تۆ هەموو کات دڵ خۆشبوی واتە ناخۆشیت نەبینی ئەوە نابێتە کەسێکی سەرکەوتوو بۆ نموونە : رۆژێك گەنجێك خۆی کوشت نامەیەکی بە جێ هێشتبوو نوسرابوو (من هەموو شتم هەبوو باشترین و خێراترین سەیارە و جوانترین هاوسەرم وە بە دلی خۆم بوو وە هەموو کات ئەوەی دەمویست بە دەست دەهێنا بەڵام هیچ ناخۆشیم نەدیت بۆیە خۆم کوشت بێزار بووم لەوەی کە هەموو ژیانم خۆشیبێ بۆیە خۆم کوشت). لەژیان دا دەبێ ناخۆشیش ببینێ چونکە دەبێ لە هەردوو کاتدا دەبێ سوپاسی خودا بکەین چونکە ژیان پێویستی بە هەردووکیانە ژیان زۆر جار ناخۆشی دەبینێ دەبێ مرۆڤ سوپاس گوزاربێ چونکە خودا تاقیمان دەکاتەوە تا بزانێ سوپاس گوزارین بە بشمان وە ناخۆشی تەواو کەری ژیانە دەبێ وە دەبێ رێگای ناخۆشەکان بەکار بێنین تا بگەینە ئەو سەرکەوتنەی بە خۆمان دەمان ئەوێ ژیان دەبێ هەمیشە خۆشی و ناخۆشی تێدا بێ چونکە بە هاردووکیان ژیانێکی تەواوت دەبێ چونکە ئەگەر تەنها بەس نەخۆشی بێ ئەوە ژیانەکی ناتەواوە وە تەنها بەس خۆشیبێ ئەوە یانەکی ناتەواوە چونکە ژیان پێویستی بە هەردووکیانە، خۆشی و ناخۆشی کاتێك کە هەردوکیانت هەبوو ئەو کات هەست بە هەموو ژیانت دەکەی کە ژیان خۆشی و ناخۆشیە ئەوەیە راستی ژیان خۆشی و ناخۆشی

کاتێك کە هەردووکیانت هەبوو ئەو کات هەست بە هەموو ژیانت دەکەی کە ژیان خۆشی و ناخۆشیە ئەوەیە راستی ژیان . لە کەسێکم پرسی وتم: ناخۆشیت بینیوا؟؟؟ وتی: بەڵێ زۆریشم بینیوە. وتم :ئەی چۆن توانیت زاڵبی بەسەر ناخۆشیەکانت؟؟؟ وتی:تەنها سەبر و ئارام بووم تا کێشەکان بەخۆی دەرۆن چونکە تەنها لە خەم زیاتر هیچمان بۆ نامێنێتەوە من بیرم کردەوە زانیم ناخۆشی ژیان خەمێکی گەورە بە دوای خۆی دەهێنێ بەڵام بە سەبر و ئارامیەکی زۆر دەتوانین زاڵبین لەسەر ناخۆشیەکانمان چونکە ئەگەر هەر چەند بێ ئارام بین وا بێ سەبر بین ئەوا کێشەکانمان زیاتر دەبێت چونکە لە ناخەوە خمەکانمان زیاتر دەبێت بۆیە هەردەم بە سەبر و ئارامی دەتوانین کێشەکانمان چارەسەر بکەین چونکە بەراستی ئێمەی مرۆڤ دەبێت لە هەموو کات ئارام و خۆراگربین تا بتوانین کێشەکانی خۆمان چارەسەر بکەین واتە ناخۆشیەکانمان لە ناو ببیەن بەرەو خۆشیەکی زۆر، خۆشی و ناخۆشی بە دەست خۆت نیە زۆر جار لەوانیە لە دەست دانی کەسەکانمان ناخۆشترین کات بێ بۆ ئێمە چونکە ئەمە کاری خودایە دەبێ هەمومان رازی بین بەوەی خودا پێمان دەبەخشێ لەوانەیە ئەمە تاقیکردنەویەیك بێت لە لای خودا بۆ ئەوەی بزانێت کە چۆن دەتوانین مامەلە لە گەل کێشەکان دەکەین چونکە بەراستی مرۆڤ هەموو کات وریان نیە لە هەندێك شت دەبەن وەك نموونەیەك لەسەر مرۆڤ و کاتەی کە ناخۆشی دەبینین هانا بۆ خودا دەبەن کە ناخۆشیەکانیان بروات وە ئەو کاتەی کەخۆشی دەبینین خودای خۆیان لەبیر دەکەن لەبەر خۆشیەکانیان، وە

هەندێکی تر هانا بۆ مادەی هۆشبەرەکان دەبەن بۆ ئەوەی ناخۆشیەکەنیان لە بیر کەن بەڵام لە راستی دا ئەمە دەبێتە هۆی ناوچونی خودی کەسەکە نەك ناخۆشیەکە، ئاخ مرۆڤەکان ئێوە چۆن دەتوانن وا بکەن هەردەم سوپاس گوزاری خودا بکەن لە راستی دا ئێمەی مرۆڤ دەتوانین هەندێك شت هەیە بیەکەن بەڵام ئەمەش کاتی دەوێت بۆ چارەسەری دەوێت بۆ کێشەکانی ئایە ئەمانە بە زوترین کات چارەسەری دەکرێت؟ لە وەلامی من دا نەخێرە چونکە ئێمەی مرۆڤ هەر چەند ئارام بگرین هەر چەند هێمن بین لە کارەکانمان لە ناخۆشیەکنمان دا هەر کەمە چونکە ئێمە دەتوانین زاڵ بین لەسەر ناخۆشیەکنمان دا بیکەنە خۆشیەکی ژیانمان بەڵام مرۆڤ دەیەوێت بە زوترین کات کێشەکان چارەسەر بکەن وە بە زوترین کات خۆیان لابدەن لەم کێشانە وە لە نا خۆشیەکانیشیان دا بەڵام هەڵەن تەنها بە ئاقڵانە و بە ئارامی و بە کاتی درێژخایەن بەڵام بێ ئەوەی کات بە فیرۆ بدەین تا بتوانین ئەو خۆشیەی کە دەمان هەوێت بە دەستی بینین وە بە ختەوەر بین لە خۆشیەکانماندا ئەمە راستی ناخۆشیە کە بە کات و ئارام گرتن دەروات بەرەو خۆشی ژیان، خۆشی ژیان زۆر بەی کات وامان لێدەکات کە خۆمان لەبیر کەین وە دلْمان ئاسودە دەبێت وە هەردەم ژیانمان بەرو خۆشیەکان تەواو نابێت ژیانێك پرلە خۆشی دەبێ کە ناخۆشی نەبینی بەمە نالێین ژیانی راستەقینە چونکە ژیانی راستەقینە پێویستی بە هەردوکیانە بۆ بەردەوام بوون لە ژیان دا، واتە تا ئەو تەمەنەی تێدا دەژین دەبێت ناخۆشی و خۆشی ب بینین چونکە ژیانی بەردەوامە دەبی وابکەیت کە

خۆشیەکان نەبێتە هۆی تێکچونی هەموو شتێك وە هەروەها ناخۆشیەکانیش نەبنە هۆی تێکچونی هەموو شتێك، ژیانی خۆشی و ناخۆشی کە ژیانێکی تەواوت پێدەبەخشێ کە مرۆڤەکان تاقی دەکرێنەوە لەلای خودای گەورە هەردەم خودای گەورە تاقیمان دەکاتەوە ئایە سوپاس گوزارین لە بەرامبەر خودای گەورە وە هەروەها ئایە ئێمە هەموو کات خودای خۆمان لە بیرە وە رۆژێك دادێت لێمان دەپرسن ئایە ئەو کاتەی ئێمە ناخۆشیمان بینی کە پاراینەوە لەبەرامبەر خودای گەورە ئەو دوعای ئێمەی قبولّ کرد خۆشی دایە ئێمە وە ئێمەش چیمان کرد کاتێك خودای گەورە دوعای ئێمەی قبول کرد خۆشی داوەتەوە ئێمە ئایە خودای خۆمان بە بیر دەمینێ ؟؟ لە راست دا لە زۆربەی کەسەکانم پرسی وتم خودای خۆتان بە بیر دەمینێ وتیان نا واللە لە بیرمان کرد، کە چی خودای گەورە هەمیشە لێمان خۆشدەبێت هەردەم لە کاتی ناخۆشی دا خۆشیمان پێ دەبەخشێ بۆیە هەردەم سوپاس گوزار دەبم لەبەرامبەر خودای گەورە چونکە هەر ئەو دەتوانێ هەموو کات خۆشی و ناخۆشیمان بداتێ، مرۆڤەکان ئێوەش دڵنیابن خودا لە بیرتان ناکات ئەگەر ئێوە هەردەم خودای خۆتان بە بیر بێ مرۆڤەکان ئەمەش راستی خۆشی و ناخۆشیە مرۆڤەکان ئیتر خۆتان بزانن چۆن دەتوانن لە ژیانێکی بە دڵی خۆتان بژین ئەمە راستی ژیانە.

## ٩- کـــــــات

(کات وەك شیر وایە ئەگەر نەیبری ئەوا دەتبڕێ) ئەوە پەندێکە لەسەر کات، کە کات وەك شمشێر تیژە ئەگەر نەت توانی ئەو کاتە ببڕی ئەوا کات دەتبڕێ، کات کە مرۆڤەکان زۆر بەی کاتی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن ژیانمان هەمووی لە کات دروست کراوە کە رۆژێك دادێ پێت دەلێن ئەو کاتانەت بە چی بەسەر برد وە ژیانت بە چی بە فیڕۆ دا کە ژیانێك لە کات دروست کرابێ نابێ بە فیڕۆی بدەین کەسایەتیمان وە مرۆڤایەتیمان هەمووی لەو کاتدا دابینین، ژیان واتە کاتیێ دەبێ بۆ هەموو کات بکەی چونکە کەس نازانێ تەمەنی تۆ چەند دەبێت تەمەنیش هەر لە کات پێك دێت، ژیانتان لەو کاتانە بێ باش مەکەن چونکە رۆژێك تر پەشیمان دەبن چونکە ژیان بەردەوام دەبێ تا ئەو کاتەی خودا بۆی نووسیوین، مردوو هیوا دەکات بگەرێتەوە بۆ ژیان تەنها چاکەیەك بکات وە کەسە پیربووەکان دەیانەوێ گەنج ببنەوە تا بتوانن زیاتر ئەو کارانەی دەیانوێ بیەکن وە گەنجیش دەیەوێ بچووك ببێتەوە تا خەم نەخوات و هەرچیەکی دەیەوێ بیکات وە بچووکیش دەیەوێ گەورە بێ، وە لە ژیانیشمان هیوا بۆ مردن دەخوازین، ئێمە دەبێ هەول بدەین لەو کاتانەی کە رۆیشتن دەبێ کەرێکی وامان کردبێ کە هیوا بۆ گەرناوەی کات نەخوازین چونکە ئەگەر کەسێك کارێکی هەڵەی نەکردبێ هیوا بۆ گەرناوەی کات ناخوازێ، وە ئەگەر هەلەشمان کرد ئاساییە بەڵام بە مەرجێ جارێکی تر ئەو هەلە دووبارە نەکەینەوە، نابێت بۆ یەك ساتیش

کاتت بە فیڕۆی بدەی چونکە پەشیمانی زۆر کاریگەرە لە ژیان، کات کات کات دەڕوات بەبێ ڕاوستان بێ ئەوەی هەستی پێبکەین چونکە ژیان بەردوامە هەست بکەن کاتەکان زۆر زوو دەڕۆن بێ ئەوی هەستیان پێ بکەی، کاتت بە فیڕۆ مەدا ئەی مرۆی چونکە بە فیڕۆدانی کات واتە بە فیڕۆدانی ژیانت دوایی پەشیمان بوونەوە کارەکانت بۆ ڕێك ناخات زەرەر دەگینێ بە ژیان، نموونەیەکی کـــات لە ژیـــــان دا کـــــە " جین ڕینو" دەڵێ : تەمەنــم ١٧ ساڵ بوو کە عاشــق بووم... تەنانەت هەوڵمدا لە پێناویدا بمـرم ... دوو ساڵ دوای ئەوە تەنانەت ناوەکەیشم لە بیرچۆوە ...لە ڕاستیـدا کات هەموو شتێك پاك دەکاتەوە !...کات وات لێ دەکات کە هەموو شتاکانت لە بیر بچێتەوە وە هەروەها هەندێك کات مرۆڤەکان کاتە خۆشەکان زوو لە بیر دەکەن وە کاتە ناخۆشەکان لەبیر ناکەن چونکە خەمیان زۆر خواردووە، رۆژێك دێت خەم بۆ ئەو کاتە دەخۆین کە تیدا پێکەنیوین وە پێدەکەنین لە کاتێك دا خەمان بۆ خواردبوو، کات زۆر بە نرخە بۆ مرۆڤ ئەگەر یەك سات بە فیڕۆ بدەی پەشیمان دەبیتەوە چونکە کات بریتیە لە ژیانی مرۆڤ کە تەمەنی مرۆڤ دیاری دەکات کە ئەو کاتە دەبێتە هۆی کە ژیانی مرۆڤ کە تێدا دە ژیت وە هەروەها کارەکانی بۆ دیاری دەکات وە خودای گەورە لەو تەمەنەی کە بۆی دیاری کردووین هەموو کات شتە هەڵەکان وە باشەکان دەبینێ تا ئەو کاتای بۆ خۆمان دەباتەوە ئینجا پێمان دەڵێت لەو چەند تەمەنەی ژیانت کرد چیت کرد کە ژیانمان هەموو کاتە کات بە فیڕۆدانیش دەبێتە هۆی زیانێکی گەورە بۆ مرۆڤەکان لە هەمان کات

هیوا دەکەین کە بگەرینەوە لەو کاتانەی کە بە فیرۆمان دا تاکو کارێکی باش بکەین کە ئەم کارە باشە ببێتە هۆی باشی بۆ ئەو کاتە بۆیە دەڵێم کات بە فیرۆ نەدەن چونکە پەشیمان بۆ ئەو کاتە ناخوات مرۆڤەکان وریابن چونکە ژیان بەردوامە تا تەمەنی خۆتان تەواو دەبێت، لە کەسێکم پرسی: لەلای تۆ کات چیە وە کات چۆن بە رێوە دەبەی ؟ لە وەلامی دا وتی : کات ئەوەیە کە ژیانم بەسەر دەبەم وە کات تەنها بۆ خۆشی ژیان کراوە ! منیش وتم : ئەی کاتت نیە کە سوپاسی خودا بکەی وە نوێژت بکەی ؟ لە وەلام دا وتی: خودام بە بیرە بەلام زۆر بەی کاتم بە فیرۆ دەدەم، وتم : ئەی بۆ ئەو رۆژەی کە لەبەرامبەر خودای گەورەی چی دەکەی ؟؟ وتی : ئەو کات نازانم پەشیمان دەبمەوە، کەواتە مرۆڤەکان ئێوە وا مەکەن کاتان لە دەست بچێ واتە لە ژیانتان هەموو کات خودای خۆتان بە بیر بێ دلنیا بە خودای گەورە لە بیرتان ناکاف هەردەم چاکەکانتان دەداتەوە ئەگەر لەم دونیایەش نەبێ لەو دونایەی تر، " بۆ هەر خولەکێك کە تورە دەبی، شەست چرکە لە بەختەوەری لەدەست دەدەیت." ئینجا بۆ وابکەین کە توربین تورەبون زیانی زۆر پێدەگەیەنێ وە کاتمان زۆر لە ژیان دەکوژێ وە بەرەو ناخۆشیمان دەبات بەراستی تورەبون هەموو شتێك لە ژیان تێك دەدات وە کاتیشمان زۆر لە دەست دەدات تا چاك دەبینەوە بەراستی تورەبوون هەموو شتێك دەگۆرێت تەنانەت کاتیشمان لێتێك دەدات، کات لە ژیان وامان لێدەکات بیر بکرینەوە وە وامان لێدەکات بتوانین خۆشی و ناخۆشی ب بینین کات وامان لێدەکات بتوانین هەموو شتێك بە چاوی

خۆمان ببینین کە هەرگیز چاوەروانی ئەمەت نەدەکرد کات زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ بۆیە هەردەم دەڵێم کـاتان بە فیرۆ مەدەن چونکە تا پاشگەز نەبنەوە بۆ ئەو کاتە، بە پێی کاتەکان هەموو کەسەکانی دەورو بەرت دەناسی وە هەموو برادەرکانت بۆ دەردەکەوێت بۆیە هەردەم کات لە لاتان بە نرخ بێ چونکە کاتەکان زۆر شتان فێر دەکات وە زۆر شتان نیشان دەدات کە هەرگیز نەتان بینیوە وە نەشتان بیستوە ، لە کەسێکم پرسی : ئایە کات هیچی بۆ کردوویت ؟؟؟ لە وەڵام دا وتی : بەڵێ . وتم : وەکو چی ؟؟؟ وتی : وەك ئەوەی توانیم هاورێیکم بناسم وە هەرواها توانیم کارەکانم بەتەواوەتی بکەم وە رۆژێك بینم کە گەیشتمە ئارەزوی خۆم کە هەموو خەونوو ئاواتم بوو . وتم : ئەی کات لەلای تۆ زۆر بە نرخە ؟؟؟ وتی : بەڵێ بەس تەنها سوپاس گوزارم کە خودای گەورە کە چەند کاتی داوەتە بە من بۆ ئەوەی بتوانم هەلەکانم راست بکەمەوە .بۆیە مرۆڤەکان سوپاسی خودا بکەن چەند تەمنی داوەتە بە ئێوە تنها خودای خۆتان لە بیر مەکەن چونکە خودا ئەو تەمەنەی بە ئێوە بەخشیوە تا بتوانن شتێك بکەن تا بتوانن پاداشتی ئەم ئیشە باشانەتان لە لای خودای گەورە وەرگرن ئەگەر چیژ لەو دونیادا وەر ناگرین ژیانتان خۆشکەن بە کاتەکانتان وە چاوەرێی ژیانێکی باشتر بکەن وە بە پێی کات هەوڵ بۆ ژیان بدەن وە ئەم ژیانەتان پێوانە دەکرێ بە کات چونکە کات تەمەنی تۆیە بۆیە هەردەم کات و خودای خۆتان بە بیر بێ تا بتوانن سەر کەون بەسەر هەموو شتێك نەك چەند شتێکی بچووك چونکە ژیانمان بەردەوامە تا خودا بۆ

خۆمان دەباتەوە وە لە پاش ئێمەش کات راناوەستێ بەردەوامە بۆیە دەبی وابکەین کە ئەو کەسانەی لە دوای خۆمان هەن بزانن کە ئێمە کاتمان بە فیرۆ نەدایە ئەوانیش شتێکی باش لەوە فێربن وە هەروەها ئەگەر بە فیرۆشمان دابێ با ببێتە پەندێك بۆ نەوەکانی دوارۆژمان بەراستی مرۆڤەکان دەتوانن هیوا و ئاواتەکەیان لەگەڵ چەندی کات ببەنە سەر تا بتوانن سەر کەوتوو بن لەوەی کە دەیانەوێ کات هەموو کاتێك گرنگە بۆیە نابێت بە فیرۆی بدەین ژیانمان بەو جۆرە دەبێت کە چۆن مامەلە لەگەل کات دەکەین، زۆر جار دەڵێین ئەوە بۆ کات ناروا دەروات بەلاّم ئێمە هەستی پێناکەین بەراستی ئێمە ناتوانین گرینگی کات بزانین کات هەموو شتێکمان پێدەبەخشێ بەلاّم تەنها بە ئارامی و سەبر گرتن وە کاتیشمان لەلا ئەزیز بێ ئەو کات دەتوانین هەموو شتەکانمان بکەین بە پێی کات، رۆژێك پرسیم لە مرۆڤێك کات زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ ؟؟؟ وتی : بەڵێ چونکە ئەگەر کات نەبوایە تەمەنی ئێمەش نەدەبوو بۆیە کاتمان پێویستە تا بتوانی ژیان ب بەینە سەر . من زۆر دڵ خۆشم کە هەندێك کەس هەن گرینگی بە کات دەدەن ژیانمان خۆشتر دەبێت کە ئێمە وا بیری لێ دەکەین و بەراستی کات زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ ئیتر مرۆڤیش خودا خۆی لەبیر نەکات چونکە خودای گەورە هەردەم ئاگای لێمانە کە کاتێك کات بە فیرۆ دەدەین ژیانی ئێمە بۆتە کات وە کاتیشمان زۆر کەمە تەنها بۆ ئەوەیە کە بتوانی ژیانی خۆمان ب بینە سەر، ئەمە راستی کاتە پێویستە هەموو مرۆڤێك بزانن کە کات چەند بە نرخەوە باش بزانن کات دەروات بە بێ راوەستان وە تەمەنی

ئێوەش ڕاناوەستێ مرۆڤەکان ئینجا قەدری ئەم کاتە بزانن ئەمە ڕاستی کاتەکاتنانە وە ئەمەش ڕاستی ژینتانە .تا لە نرخی ژیان دەگەین نیوەی تە مەنمان بەسەر دەچێت...! (هێر بەرت)

# ١٠- ئامانج

هەر یەکێك لە ئێمە ئامانجێکی خۆی هەیە کە ئێمە هەول دەدەین ئەو ئامانجە بە دەست بهێنین بە هەر شێوەیەك بێت کە ئەمەش وادەکات تا رادەیەك لە ژیان بەردەوام بین . ئامانجەکانی مرۆڤ زۆر گرنگە دەبیٚ بزانین بۆچی دەژین وە بۆ چی هەولٚ دەدەیەن وە بۆچی ژیانمان بەسەر دەبین وە ئامانجی ئێمە چیە لە کاری رۆژنەمان ؟؟؟ مرۆڤەکان لە ژیانیان دا دەبیٚ ئامانجێکیان هەەبیٚ بۆ ئەوەی هەولی بۆ بدەن چونکە ئەگەر ژێان بیٚ ئامانج بوو واتە بوونی ژیان نیە هەرمووومان بە شتێك خەریك دەبین بۆیە ئامانجی ژیان بە یەك شتمان خەریك دەکات تا بتوانین بۆی بژین تا بتوانین هەولٚی بۆ بدەین ئامانجی ژیان زۆر شتی لە خۆوە گرتووە بۆ نموونە ئەگەر ژیان بیٚ ئامانج بوو واتا ژیان نیە لە کەسێکم پرسی : ژیانی تۆ ئامانجی هەیە وە بۆچی ئەو ئامانجەت هەلبژارد ؟؟؟ لە وەڵامی دا وتی : بەلٚیٚ ئامانجێکم هەیە بۆیە من ئەو ئامانجەم هەلبژارد تا بتوانم بۆ ئەو شتەی کە دەمەویٚ بژیم نەك بیٚ هیوا بم لە ژیان بیر کردەوە بیٚ ئامانجی دەبێتە هۆی بیٚ هیوایە ژیان واتە تۆ هیچ شتێك نیە کە بۆی بژی تا بتوانی بۆی هەولٚدەی سەری مرۆڤەکنی دەوروبەرت بکە بزانە هەرکەسە و بۆ ئامانجێك دەژیت واتە ژیان بیٚ ئامانج سەختە واتە نەبوونی ئامانج واتە نەبوونی ژیان بۆیە مرۆڤەکان پێویستە هەرکەسە و بۆ خۆی ئامانجێکی سەرەکی هەبێت تا بتوانین

بۆی هەوڵ دەین، ئامانجێکی کارکردن زۆر گرنگە ئەگەر هەر کارێکت کرد ئامانجێکی گەورە بۆ خۆت دانێ تا بتوانی زیاتر حەز بە ئیشەکە بکەی وە زیاتر حەز بە ناخت بکەی کە ئەو چی دەوێ وە تا بتوانی سەرکەوتنی گەورە بە دەست بێنی وە هەردەم ژیانێك ببەسەر کە ئامانجێکت هەبێنەك بێ ئامانج ئەگەر بێ ئامانج ژیای واتە تۆ نەبوونت باشتر دەبێت چونکە خەفەت بەو ژیانە دەخۆی نازانی بۆ چی دەژی ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ کە نەزانێ بۆچی دەژین واتە تۆ هیچ ئامانجت نیە کە بۆی بژی مرۆڤەکان هەردەم دەبێت حەز بە ئامانجی سەرەکی خۆیان بکەن وە هەمیشە یژانیان خۆشتر بکەن ئامانج دانان زۆر گرنگە تۆ ئامانجی گەورە و بە بەها دانێ تا زیاتر بۆی هەوڵ بدەی تا بتوانی لە ژیان تێبگەی مرۆڤەکان تۆ ئامانجی خۆت دانێ وە زۆر بۆی هەوڵ بدە تا ئەو کاتەی ئامانجەکەت دێتە دی بەڵام تۆ هەوڵ دە وا بە پشتیوانی خودا هەندێك کەسمان هەیە تەنها لە ماڵ دانیشتووە هەر دەڵێ خودا بۆم دەهێنێتەدی ئامانجەکەم بەڵام هەڵەی مرۆڤەکان تۆ دەبی هەولّبدەی تا خودای گەورە یارمتیت بدات، ئامانجەکانی ژیان زۆر گرنگە لە ناخەوە دەبێ هەست بە ئامانجەکان بکەین تا بۆیان هەوڵ دەین، بۆ نموونە : خوێندکار بۆ دەخوێنێ تا ناجح بێ، مرۆڤەکان بۆ ئیش دەکەن تا پارەیان هەبێ بۆ پێداویستەکانی ژیانیان بکرن، ئامانجی ژیان زۆر کاریگەری لەسەر مرۆڤ دەبێت هەموو مرۆڤێك پێویستی هەیە کە ئامانجی سەرەکی ژیان بزانێ هەندێك مرۆڤ هەن کە نازانن ئامانجی سەرەکی ژیان چیە بۆیە لە هەموو لایەکەوە شکست دێنن ئەگەر تۆ

بزانی ئامانجی سەرەکیت چیە تەنها بۆ ئەو شتە هەوڵ دەدەی تەنها تاکە هیوای ژیانت دەبەخشی بەو ئامانجە کە خۆت حەزی پێ دەکەی بەراستی ژیانمان پێویستی بە ئامانجە تا بتوانین بژین، هەموو کات ئامانجەکەنی ژیان زۆر زۆرە بەڵام ئێمە دەتوانین تەنها یەك ئامانجی سەرەکی هەڵ بژێرین تا بتوانین زیاتر لە هەموو شتەکانی تر گرینگی پێبدەین هەردەم من بۆ خۆم ئامانجی سەرەکیم بۆ خۆم هەڵبژاردووە هەر کەسەو دەتوانی بۆ خۆی هەڵبژێرێ چونکە ئامانج دانان شتەکی تاکە کەسیە نەك خەڵکی دی بێنە ناو ژیانی کەسەکەوە هەمووی لێ بشێوێنن بەراستی کەسێك ئامانجت بۆ دانێ دلنیا بە سەر ناکەوی چونکە لەوانەیە تۆ خۆت حەزی پێنەکەی کە خۆت دەتەوێ هەموو مرۆڤەکی تاکە کەس دەتوانێ بریار لەسەر ئامانجی خۆی بدات، ئامانج دانان کارێکی زۆر قورسە بەڵام کە دات نا هەوڵی زۆر بۆ دەدەی کا تا پێبگەی ئەو کاتەی کە پێگەیشتی دەتوانی هەموو هیوا و ئاواتەکانت بهێنیتە دی، ئامانجی سەرەکی مرۆڤ ئەوەیە کە هەرگیز خودای خۆی لەبیر نەکات وە خودای گەورەش پاداشی ئەو دەداتەوە کە هیوایت و ئامانجەکەت دێنێتە دی ئەگینا تا مردن هەر چاومان لەو ئامانجە دەبێت کە بۆمان بێتە دی بەڵام ئەو کات هیچمان بۆ ناکرێ خەم بۆ رابردوومان دەخۆین کە نەمان توانی ئامانجی خۆمان بێنینە دی بەراستی کارەساتە بۆ مرۆڤ نەتوانێ ئامانجی خۆی بینیتە دی ژینمان پێویستی بە ئامانجە تا بتوانین ناخۆشی و ماندوو بوونی پێوە بچێشین تا لە ئەنجامەکەی ئامانجی سەرەکیمان بێتە دی ئەو کات هەست بە خۆشیەکی زۆر

دەکەین وە هەست ناکەین ماندوو بوەین بەراستی ژیانمان زۆر لەوە خۆشتر دەبێت کە خۆمان تێی دەروانین بەڵام بە توانای خۆت کاربکە وە خودای گەورەمان لە پشتە بۆیا هەردەم خودای گەورەمان لە بیر بێت تا بتوانین هەموو ئامانجەکانی خۆمان بە بیر بیٚ بە بیٚ هەڵە ژیان بکەی ئامانج زۆر باشە بۆ مرۆڤ ئەگەر بتوانین بە بیٚ هەڵ کاری پێبکەین ژیانمان پێویستی بەو ئامانجەیە تا بتوانین بۆی بژین تا بتوانین هەوڵی بۆ بدەی تا ناخی خۆمان ئاسودە بکەین تا هەست بە بێزاری نەکەین لە ژیان وە تا بزانین ئێمە بۆچی دەژین بۆچی هەوڵ دەدەین، هەندێك مرۆڤ هەن بیٚ ئامانج دەژین کەواتە ئەو جۆرە مرۆڤانە ژیانیان نیە تەنها بۆ یەك جاریش ناتوانن بە دڵ خۆشی بژین چونکە نازانن بۆ چی دەژین تەمەنیشیان بە فریۆ دەروات ئەو کاتەی کە پیر بوون ئینجا بیر دەکەنەوە ئایە بۆ ئامانجێکیان بۆ خۆیان دانانە پەشیمان دەبن کا نەیان زانی بۆ چی دەژین بۆ چی وا کات بەسەر دەبەن ئەو کات دەیان هەوێت بگەرێنەوە تا ئامانجێکی سەرەکی بۆ ژینیان دانێن بەڵام کات بەسەر چوو ئیتر ناگەرێتەوە، کەچی جاران ئامانجەکانمان کەمتر بوو کە چی ئێستا زۆر ئامانجی ژیانیان هەیە بەڵام زۆر کەسمان هەیە ئامانجی ژیانی نیە بۆیە کەسێکی سەرکەوتوو نابێت لە زۆر لایەن بۆیە دەڵێم مرۆڤ ئاگاداربن کە هەر چەند زووتر ئامانجی خۆت دانیٚ هەر کەمە چونکە کات بەردەوامە تا لەسەر هێزی خۆمانین با ئامانجی خۆمان بینینەدی رۆژێك دادیٚ تا پەشیمان نەبوینەوە بۆ گەرانەوە بۆ ئەو تەمەنەی کە دەمانەوێت ژیانمان خۆشتر بکەین تا ئامانجی سەرەکیمان

بینینەدی رۆژەکانتان لە دەست مەدەن هەردەم هەوڵی بۆ بدەن تا بتوانن سەرکەون تا ناختان ئاسودە بکەن، مرۆڤی ژیرهەردەم ئامانجی سەرەکی خۆی دادەنێ تا بە زووترین کات بگاتە مەبەستی خۆی وە تا دڵی خۆی خۆشتر بکات وە ژیانی خۆی لە داهاتووەکەی نزیکتر بێت وە هەردەم هەست بە داهاتوویەکی گەورە بکات بەراستی مرۆڤە ژیرەکان هەردەم ئامانجی گرینگ بۆ ژیانیان دادەنێن وە هەوڵی بۆ دەدەن تا بە زووترین کات بۆیان بێتە دی، مرۆڤەکان ئێوەش جیاوازیتان نیە لەگەڵ ئەو کەسانەیی کە بە ئامانجی خۆیان گەیشتوون تۆش هەوڵ بدە تا بتوانی بەو ئامانجەت بگەی کە خۆت دەتەوێت، مرۆڤەکان ئەمە راستی ئامانجی ژیانە وە ئەمەشە دەبێتە داهاتووی تۆ وەژیانتان دەگۆرێت لە ناخۆشی بەرەو خۆشیەك زۆر ئامانجی ژیان هەردەم پێویستە بزانین تا هەوڵی بۆ بدیەن تا سەرکەوتن بە دەست بێنین، راستی ئامانجەکانی ژیانت بزانە وە ئەمەش راستی ژیانە کە دەبێ بیزانین.

## ١١ - ساتێك بۆ رابردوو

(رابردووی ئەلماس خەلوزە) ئێمە هەموومان دەزانین کە ئەلماس بەنرخترین خشلە، بەلاَم ئەوەش بزانە کە رابردووی ئەلماس خەلوزە، کە هەموومان رابردوێکمان هەیە کە پەیوەستە بەو باردۆخەی کە تێدا ژیاوین بۆیە دەبێت ئێمە بریار لە سەر هیچ کەسێك نەدەین کەرابردووێکی باشی نەبێت .رابردوو ئەوەیە کە هەموومان لێی ترساوین چونکە هەر خەمی رابردوومانە کە ئێستا ئازاری پێوە دەچێشین چونکە ئەگەر رابردوومان پر لە خەم بێت ئەوا داهاتووشمان هەر خەم دەبێ بۆ نموونە " ئالبێرت کامو" دەلێ : ئێمە نەك بەس لە زیندوەکان بێزارین بەلْکو لە مردووەکیانیش بێزارین چونکە مردووەکان زیندوی کۆن بوون .

بۆیە ئەو ئازارەی کە پێوە دە کێشین ئەمە ئازاری رابردوومانە ئەگەر رابردوومان خۆشبوایە ئێستاش ژیانمان خۆشدەبوو وەك لەوەی کە ئێستا تێدا دەژین بۆیە دەبێت ئێمە لەم کاتەدا خۆمان چاك بکەین بۆ نەوەکانی دوارۆژ، خەم بۆ ژیانیان نەخۆن تا بتوانین رابردوویان لە بیر بکەین ژینمان پەیوەستە بە رابردوو، رابردوومان چۆن بێ ئێمەش وا دەبین بۆیا تا زووە با خۆمان بگۆرین بۆ ئەوەی نەوەی داهاتوومان پێشکەون تا خەم بۆ رابردوویان نەخۆن چونکە ئەگەر ئێمە هەر لەسەر رابردووێکی خەمناك برۆین بەراستی کاریگەرە چونکە ئێمە نابێ خۆمان خەم بخۆین لە رابردوومان دەبێ خەم بۆ ئێستا و داهاتوومان بخۆین چونکە داهاتوومان پێویسترە لە رابردوومان دەبی بلێین ئەوەی رۆی

ڕۆیی پەرەیەکی نویٚ هەڵ دەینەوە بۆ ئەوەی ژینمان خۆشتر بکەین
هەم ژیانی داهاتوومان خۆشتر بکەین هەم نەوەکانمان با ئازار نەکێشن
بە هۆی داهەتووی ئێمەوە چونکە رابردووی ئەوان داهاتوویان تێك ئەیات
بۆیە ئێمە دەبیٚ لە رابردوومان دا هەندێك شت هەیە کە دەبیٚ بیگۆرین
واتە نابیٚ خەمی پێوە بخۆین وە رابردوومان وا دانێین خۆشتربووە کە
ئێمە تیدا دەبینین وە خۆشمان بگۆرین تا نەوەکانی داهاتوومان خەم
ناخۆن بۆ رابردوویان تا باسی رابردووی خۆیان بکەن بە جوانترین شێوە
تا لە جیهانێکی پر لە خۆشیدا بژین وە ئەوانیش هەمان شت بکەن بۆ
نەوەکانیان واتە ئەم کات داهاتووەکانمان هەمووی لە خۆشیدا دەبێت
بۆیە رابردوومان زۆر کاریگەرە بۆ ئێستا و داهاتوو ژینمان با لە ئازاری
رابردوومان نەبێت بەڵکو بە لە خۆشیدا بێت ژیانتان لەگەڵ رابردووتان
باشتر بکەن هەم دەبیٚ بۆ داهاتووتان زیاتر دڵ خۆشبن تا هەست بە
ئارامیەکی تایبەت بە رابردوومان بکەن بۆ داهەتوومان زیاتر خۆشتر بێت
لەوەی کە خۆمان تیدا دەبینین ئ٥م٥ داهاتووی تاکە کەس بە
رابردووکەیتی بۆیە ژینمان پەیوەستە بە داهاتوومان ژینمان خۆشتر
دەبێت ئەگەر رابردوومان باشتر بێت بۆیە تاکە کەس زۆر کاریگەرە
لەسەر رابردووی مرۆڤەکان ئەمە راستی تاکە کەسێکە بۆ رابردووەکەی
کە رابردووێکی بە ئازار بێت بۆ داهاتووشمان زۆر کاریگەر دەبێت
بۆیەدەبیٚ ئێمە ئەو رابردووە بگۆرین تا نەوەکانمان ئازار نەکێشن بە
دەست داهاتووی ئێمەوە بەراستی کاریگەرە ئەگەر رابردووی هەموومان
هەر خەم بێت وە داهەتووشمان دەشێوێنێت، ئێمە کورد بەشێك بووین

لە رابردووی تاڵ بۆیە ئێستا دەناڵێنین بەرەو داهاتووی ناخۆش وە دەبێت رابردوومان بکەین بە پەندێك بۆ داهاتوومان وە شتێك لەوە فێربین وە بەڵام ئێمەی کورد لە رابردووی خۆمان پەشیمان نین بەڵام پێویستە هەوڵ بدەین داهاتووی خۆمان باشتر بنیاد بنێین وە پشت بە توانای خۆمان و نەوەکانمان ببەستین ئەوەی کە لە رابردوو هەڵەمان کردووە راستی بکەینەوە. مرۆڤەکان ئێوە دەبێت خۆتان زۆر باشتر بکەن تا بتوانن خۆتان داهاتووتان باشتر بکەن لەوەی کە خۆتان پێشبینی دەکەن ژیانتان پەیوەیست مەکەن بە رابردووتان ئەگەر رابردوویێکی ناخۆشتان هەبوو بەڵکو ئێوە بێگۆرن بۆ داهاتوویێکی خۆشتر، ئێمە ناتوانین هەموو رابردوومان لە بیر بکەین چونکە هەموو مرۆڤێك خاوەن کەلتوری خۆیەتی بۆیە کەلتور و زمانمان وە مێژوومان نابیَ لە بیر بکەن چونکە زۆربەی وڵاتەکان مێژوویێکی خوێناوی بووە بۆیە ئێمە دەبێت سەر بەرز بین کە لە رابردوومان دا باب و باپیرانمان چۆکیان بۆ کەس دانەناوە بەراستی وەك ئێمەی کورد سەر بەرزین بە باب و باپیرانمان چونکە تا مردن شەریان کردووە تا یەك هەناسەیان مابیَ شەریان کردووە و بەرگریان لە ئێمە کردووە تا داهەتووی خۆیان بچەسپێنێن تا داهاتووی نەوەکانیان خۆشبیَ بەڵام هەندێك رابردوو هەن کە دەبیَ زوو لە ناویان بەرین تا خەمیان پیَ نەخۆین و نەبێتە رێگر لە بەردەم ئامانجەکانمان، ژیانمان زۆر لەوە خۆشترە کە لە رابردوومان بیری لێدەکەینەوە، رابردووی مرۆڤ کە هەندێك کەس هەن حەزی پێدەکەن وە تا بگەرێنەوە هەندێك هۆ هەن تاکو بیان کەن وە ژیانیان

لە رابردوو خۆشتر بووە هەردەم حەزیان بە رابردوو دەکەن زۆربەی
مرۆڤەکان کە گەورە دەبن حەز دەکەن منداڵ ببنەوە تا بتوانن هەندێك
شتیان کردووە لە منداڵی دا راستی بکەنەوە وە هەردەم ژیانی رابردووی
خۆیان خۆشتر دەوێت چونکە مرۆڤ چەند گەورە بیت ئەوەندە حەز بە
رابردووی خۆی دەکات مرۆڤ هەردەم کێشەی گەورە دەێتە بەردەمی
چەند تەمەنی بەرەو گەورە بروات ئەوە کێشەی گەورەتریش لە رێیدایە
چونکە مرۆڤەکان سەبر سەبر مێشکیان گەورەتر دەبێت وە کێشەیان
زیاتر دەبێت دەبیَ مێشکەکانیان بەکار بێنن تا بتوانن لەسەر
کێشەکنیان زاڵ بن مرۆڤەکان بۆیە رابردوویان خۆشتر دەوێت لەبەر
ئەوەی کێشە و خەمەکانیان کەمتر بووە ژیانمان بەرەو داهاتوو دەروات
ژیانمان لە رابردوومان زۆر خۆشتر بووە وایە بۆ هەندێك کەس بەڵام ئێوە
لە رابردووتان هەدێك شتی وا بکەن بۆ ئەوەی پەشیمان نەبنەوە کە بتان
بویَ بگەرێنەوە بۆ رابردووتان بەڵام کات ناگەرێتەوە تازە تەمەنمان
بەسەر چوو ئیتر دەبیَ خەم بۆ ئێستا و داهاتوو بخۆین ژینمان لە
رابردوو بکەین بە پەند بۆ داهاتووی خۆمان لە راستی دا هەمیشە
هەڵەمان هەیە لە رابردوو بەڵام دەبیَ لەسەر ئەم هەڵەیە نەرۆین جارێکی
تر دەبیَ بۆ ژیانێکی خۆشتر هەوڵ بدەین کە رابردووی خۆمان بەجیَ
بهێلین بەراستی رابردوو زۆر تاڵ بووە بەڵام دەبیَ ئێستا و داهاتوومان
ژینمان پەیوەست دەکەین بە رابردوومان کە ئەمیش هەر خەمە بۆ
ئێستا و داهاتوو، لە کەسێکم پرسی وتم :لە چی بێزاری ؟؟؟ وتی : لە
هەندێك کەلتور کە هەموو شتێکین لە بەرامبەر بە کچ وەك ئەوەی کچ

نەتوانێ بە ئازادانە رای خۆی بدات دەبێ ماڵەوەیان هەر بریارێك بدا پێی رازیبین چونکە ناتوانێ رای خۆمان بڵێین ئەمە رابردوومان بوو کە چی ئێستا ئازادین تەنها چەند کەسێك نەبن هەر لەسەر ئەم بیر و باوەرەن، رابردوو لەوانەیە کە زۆر ناخۆشبێت بەڵام دەتوانین چارەسەری بکەین بە باشترین رێگا وە هەردەم هەوڵ دەین بۆ ئێستا و داهاتوو ژیانمان پێویستی بە ئەمەیە کە لەسەر رێگای راست برۆین وە رابردوومان بکەینە پەندێك بۆ ئێستا و داهاتوومان ژیانمان خۆشکەین خەم بۆ رابردوومان ناخۆین ژیانمان بگۆرین تاکو نەوەکانمان هەست بە ئازاری ئێمە ناکەن تا بتوانین هەموو شتێك چاك کەین ئەمە راستی ژیانە وە ئەمەش پێویستە هەموو کەسێك بیزانێ بەراستی مرۆڤەکان پێویستە بزانن کە نابێ خەم بۆ رابردوو بخۆن دەبێ بیر بۆ ئێستا و داهاتوویان بکەن، وە نابێت هەرگیز ئەو کەسانە لە بیر بکەین کە لە رابردوودا کارێکیان کردووە کە ئێستا ئێمە لە سایەی ئەوانەوە بەردەوامین لە ژیان.

# ١٢- کێشەی خێزان

کێشەی خێزان یەکێکە لە کێشەکانی کۆمەڵگا چونکە خێزان لە یەکتری جیا دەکاتەوە هەموو شتێك وێران دەکات تەنانەت ژیانیشمان پارچە پارچە دەبێت کێشەی خێزان ئەوەیە کە هەموو کەسێك لێی دەترسێت چونکە هەر کێشەی خێزانە دەبێتە هۆی خێزانەکە بەردەوام نەبێت وە چەندین منداڵ بە دەست کێشەی خێزان دەناڵێنن، ئەمەش گەورەترین کێشەی مرۆڤی دەنێتەوە بەراستی کێشەیەکی گەورەیە ئەگەر خێزانەکان نەتوانن لە یەکتری تێبگەن، پێویستە لە ناو هەموو خێزانەکاندا گفتوگۆ هەبێت وە لە هەموویان گوێ بۆ یەکتری بگرن بزانن ئەوەی تر چی دەڵێت زۆر جار لەوانەیە بچووکەکان شتێك بزانن کە گەورەکان نەیزانن وە بە پێچەوانەشەوە لەوانەیە گەورەکان شتێك بزانن کە بچووکەکان نەیزانن پێویستە هەموومان گوێ بۆ یەکتر بگرین تا کێشەی بۆ خۆمان زیاد نەکەین وە کێشەی خێزانیمان زیاد نەبێت وە بتوانین هەموو کارەکانمان بە یەکەوە ئەنجام بدەین بۆ ئەوەی ناحەزەکانمان بزانن کە ئێمە هەردەم لەگەڵ یەکترین وە هەردەم ژیانمان خۆشتر دەکەین وە هەردەم پشتمان بە یەکەوە بەستووە وە ژیانمان خۆشتر دەکەین بە یەکەوە وە ئەو ژیانەی ئێمە دەمانەوێت بە دەستی بێنن بەڵام ئەگەر ژیانمان هەموو بۆوە کێشەی خێزانی واتە ناتوانین هیچ بە دەست بێنین ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ واتە تێکچونی هەموو خێزان وە هەروەها تێکچونی ژیانی تاکە کەس مرۆڤەکان ئێوە پێویستان پێیە کە بیر بکەنەوە کە چۆن بتوانن خێزانەکانتان یەك

بخەنەوە نەك هەردەم کەسێك خۆی بە گەورە بزانێ وە بڵێ نابێ لە قسەی من دەر بچن ! بەراستی ئەمە هەمووی هەڵەیە چونکە ئەگەر بێت و یەکێك لە ئەندامی خێزانەکەت کێشەیەکی هەبێت ئەمە ناتوانی بیدەرکێنی وە لە ئەنجامی ئەمەش شەڕ و ناخوشی روو دەدات لە ناو خێزان ئەو کاتەی شەر روو دەدات ناو خێزان واتە تێکچونی خێزان ئەمەش کارەساتە بۆ خێزانەکە کە ئەمەش هۆیەکەی دەگەرێتەوە سەر ئەندامەکانی خێزان کە خۆی بە گەورە دەزانێ وە وا هەست دەکات خۆی پێ لە هەموویان باشترە کە بە خۆی هیچ هەڵە ناکات لە راستیە ئەو بیرانەی هەموو هەڵەن چونکە دەبێتە هۆی تێکچونی خێزان ژیانمان دەبێ باشتر بکەین لەو بیرانە دەبێ هەموومان قسە لەگەڵ یەکتر بکەین تا بتوانین لە یەکتری تێ بگەین وە ژیانمان باشتر بکەین چونکە ژیانمان زۆر لەوە خۆشتر دەبێت کە کێشەمان کەمتر بێت ئەوەش کێشەکانمان هەموو چارەسەر دەکات، لە هەموو خێزاندا کاتێك کە کێشەیەك تێدا دروست دەبیت خۆمان وانەکەین کێشەکانمان بەرەو خراپتر بروات دەبێت لە یەکتری تێبگەین تا بتوانین کێشەکانمان کەم ببنەوە وە هەورەها دەتوانین بڵێین ئەگەر بێت و گفتووگۆ هەبێت لە خێزان دا هەموو کێشەکانمان بە گفتووگۆ چارەسەر بکەین وە رێز لە بریارەکانی یەکتر بگرین ئەوانەی ئەم کارانە دەکەن کەسانی سەرکەوتون وە خێزانێکی سەرکەوتووشی لێ دەردەچێت چونکە خێزانی سەرکەوتوو هەردەم پێویستی بە کەسانی سەرکەوتووە تا بتوانن لە یەکتری تێبگەن وە بەو کەسانەی کە توانای بەرگری لە قسەی یەکتر لە کاتی

تورەبوونیان لە ناو خێزان دا هەموو کەس لە هەموو کات هەر دڵ خۆش نیە چونکە ژیان هەموو ڕێگایەکمان پێ نیشان دەدات وە ژیانمان بە هۆی خێزنەکانمانەوە جوانە بەراستی کۆمەڵگا پێویستی بەم خێزانانەیە، ژیانمان زۆر لەوەی بیری لێ دەکەینەوە خۆشتر دەبێت مرۆڤەکان هەموو کێشەیەکی خێزانی با بە گفتووگۆ چارەسەر بکرێ نەك شەر، مرۆڤەکان خێزان ناکۆکیەك دەبێت لە خێزان بەڵام وای لێ مەکەن ئەوەندە گەورە بێت کە ببێتە کێشە بۆ هەمووتان بەراستی هەندێك جار لە دەنگ بەرزیە هەموو خەڵك تێ دەگەن کە ئەم خێزانە شەریانە وە هەروەها دەبێت ئێمە لە سەرخۆبین وە کێشەکانمان بە گفتووگۆ چارەسەری بکەین چوونکە هەموو کێشەیەك بە گفتووگۆ چارەسەر بکرێ زۆر خۆشترە لەوەی بە شەر و دەنگە دەنگ چارەسەر بکرێ وە لە هەمان کات دەبێت هەموومان گوێ لە یەکتر بگرین تا بزانین کامەمان هەلەیە تا بتوانین ڕاستی بکەینەوە هەموو کات دەبێ خۆمان پێ گەورەتر نەبێت لە هیچ کەسێکی تر یان لە ناو خێزاندا ڕکابەری یەکتر نەبین چونکە ڕکابەری یەکتر دەبێتە هۆی شەر و کوشتنی یەکەتر بەراستی کارەساتە مرۆڤەکان لە ناو یەك خێزاندا ڕکابەری یەکتر بکەن چونکە کێشەی زۆر لە دواوە دەهێنێتەوە مرۆڤەکان ئێوە پێویستە بزانن کە چۆن لەیەکتری تێ دەگەن لە ناو خێزان ڕەوشتی یەکتری فێربن کە دەزانن کەسێك بە شتێك تورە دەبێت پێویست ناکات تۆ ئەم شتە بکەی یان کەسێکی ناو خێزانتان بشکێنیەوە لە پێش چاوی خەڵك بەراستی ئێمە پێویستە هەموو هاوکاری یەکتر بکەین چونکە بە هاوکاری یەکتر دەگەینە

ئەنجامی کۆتای کە ئەنجامی کۆتای دڵخۆشی خانەوادەکاتە، مرۆڤەکان ئێوە لە هەموو کێشەکی خێزانی خۆتان بە دوور بگرن چونکە تا بتوانن کێشەکە سوکتر بکەن مرۆڤەکان ئەمە راستی ژیانە کە دەبێ بیزانین وە ئەمەش راستی کێشەی خێزانە دەبێت چارەسەری بکەین.

# ١٣ - دادپەروەری

دادپەروەری ئەوەیە کە مرۆڤ یەکسان دەکات وە دادپەروەری ئەو دۆخەیە کە مرۆڤەکان هەست ناکەن ستەمیان لێ دەکرێت و لە مافەکانیان بێ بەش دەکرێن، دەبێ هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێ بدرێت، وە هەموو کەس با مافی خۆی دەگات ئەگەر مافی لێ نەخورێ واتە مرۆڤەکان هەموویان مافی خۆیان هەیە بە یەکسانی وە بە درێژایی مێژووی مرۆڤ خەڵك داوای دادپەروەری کردووە هەردەم مرۆڤەکان جەنگیان کردووە تا دادپەروەری بە دەست بێنن وە لەهەمان کات دا ئەلبرێت کامۆ دەڵێ: هەردەم لە دادپەروەری دا تەنها هەژارەکان زیاد مەند دەبن وە کە زۆرینەی دانیشتوانی داگیر کردووە. کەواتە سەردەمانێك هەبوو کە تەنها بۆ خانەدانەکان بوو کەواتە خانەدانەکان تەنها یاسایان بۆ خۆیان دادەنە واتە یاسا دانان دەبێ مافی هەموو کەس بدات جیاوازی لە نێوان هیچ کەس یان هیچ رەگەز نەکات هەموو مرۆڤەکان دەبێ بە یەك چاو سەیر بکرێن کە مرۆڤەکان هەست بە دادپەروەری بکەن وە هەمیشە مافی خۆیان بزانن وە بزانن کە مرۆڤەکان دادپەروەری چیە وە بزانن واتەی یەکسانی چیە؟ کەواتە ئەمە دوو پرسیاری زۆر گرینگە کە دەبێت هەموو کەس بیزانن، دادپەروەری ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە ناو خۆیاندا هەست بکەن کە مافی کەسیان نەخوراوە وە کەسیان بێبەش نەکراوە لەم یاسایانە، مرۆڤەکان کە هەست کردن بە یەکسانی ئەمە دەبێتە ئەوەی کە خۆش ویستن

بەخشنیە بە هەموو مرۆڤەکان وە خەمت نەهێشت لەسەر ئەو مرۆڤانەی کە هەست بە کەم مافی خۆیان دەکەن یان نا دادپەروەرانە بوونی هەبوو لەلای ئەوان دادپەروەری هیچ لەمانە ناهێلێ لە دڵی مرۆڤ کەواتە یەکسانی مرۆڤایەتی واتە یەکسانی دادپەروەری ئەمانە هەمووی بە یەکەوە پەیوەستە ناتوانین لە یەکیان جیا بکەینەوە مرۆڤەکان هەردەم حەزیان لە دادپەروەریە بەراستی لە زۆربەی جەنگەکانی ناوخۆدا زیاتر کێشە لەسەر نا دادپەروەریە واتە نا دادپەروەری زۆر کێشە دەنێتەوە بۆیە مرۆڤەکان هەردەم پێویستە دادپەروەر بن لە هەموو شوێنێك بۆ نموونە: دادپەروەری بەرامبەر یاسادا، کە ئەمە خاڵێکی زۆر گرینگە بۆ مرۆڤەکان کە دەبێت مرۆڤەکان لەبەرامبەر یاسادا هەموو وەك یەك چاو سەیر بکرێ وە لەبەر هیچ هۆیەك وەك لەبەر مرۆڤی دەسەڵات و پارە دا مرۆڤەکان هەر وەك یەك ئاست حیساب بکات لەگەڵ مرۆڤێکی هەژار کە هەردووکیان بە یەك ئاست سەیر بکات لەبەرامبەر بە یاسا چونکە هەردووکیان مرۆڤن وە هەردوکیان خاوەن هەمان مافن وە لە هەمان کات دا ئەگەر بێت و هەردووکیان یەك سەرپێچان کردبێ دەبێ یەك سزا بۆ هەردووکیان بێت چونکە یاسا نابێت هیچیان بە گەورەتر بزانێ لە ئەوەی تر، ژیانێك کە دادپەروەری راستی و دروستی تێدابێ هیچ کات لەو شارە یان لەم ژیانە بێزار نابێت چونکە بەراستی مرۆڤەکان بۆ ژیانێکی ئاسودە و دادپەروەی دا دەگەرێن لە هەمان کاتیش هەست بە خۆشیەکی زۆر دەکەن لە هەموو کات لە هەموو شوێنێك کە بەراستی هەست بە تامی ژیان دەکات هەست بە مرۆڤایەتی دەکات هەست با مافی

خۆی دەکات مافی تاکە کەس کە لە هەموو شتێك گرینگترە، مافی تاکە کەس بدریێ کەواتە مافی هەموو مرۆڤێك دەدرێت چونکە ڕاستی مافی مرۆڤ لە تاکە کەسەوە هاتووە چونکە هەر ئەم تاکەیە هەموو شتێك دەکات هەر ئەم تاکەیە کە غەدری لێ دەکرێت وە هەر مافێکی تاکە کەس بدریێ واتە تۆ مافی هەموو مرۆڤێکت داوە، وە دادپەروەری فەرمانی خودایە بۆ بەندەکانی خۆی کە دەڵێ هەمووتان دەبێ دادپەروەر بن لەگەڵ یەکە وە هەمووتان مافی خۆتان هەیە چونکە لەلای خودا هەمووومان یەکسانین وە هەمووومان خاوەن یەك ئەرکین وە هەمووومان تەنها مرۆڤێکی سادەین لەلای خودا چونکە ڕۆژی دوایی خودا لەسەر ئەو کارە باش و خراپەمان سزامان دەکات وە هەمووومان بە یەك شێوە مامەڵەمان لەگەڵ دەکات ئێمە لەلایەن خودا دا بە یەك شێوە سەیرمان دەکرێت بۆیە مرۆڤەکانیش دەبێت بە هەمان شێوە بن نابێ نا دادپەروەربن وە نابێ مافی کەس نەدرێ هەمووومان لە بەرامبەر یاسا دا دەبێ بە یەك چاو سەیرمان بکرێ وە سزامان بدرێ بە یەك چاو، ژیانمان زۆر ئاسودە و خۆش دەبێت کە ئەگەر هەمووومان بە دادپەروەری بژین وە هەمووومان بە یەك چاو سەیر بکرێین وە ژیانێکی کە پڕ بێ لە مافی مرۆڤایەتی ئەمە ژیانی نموونەییە بۆ مرۆڤ بەڕاستی پێویستە هەموو مرۆڤیك بزانێ کە دادپەروەری چەندە خۆشە وە چەندە باشە بۆ مرۆڤ وە سودەکانی چیە بۆ مرۆڤ پێویستە هەمووومان مافی خۆمان بزانین تا سەرپێچی یاسا نەکەین وە هەست بە خۆمان بکەین وە هەست بە ئازادی مرۆڤایەتی بکەین کە مرۆڤی ئازادی هەردەم مافێکی دادپەروەی بە سەر هەموویان دا سەپێندراوە،

دادپەروەری لە بواری ئابوریدا کە ئەمەیان زۆر گرینگە هەر وەك خودای گەورە دەفەرمووێ)) :ماڵتان لە ناو یەکتریدا بە ناهەق مەخۆن )) وە خودای گەورە هەموو ئەو کار و رەفتار و شێوازانەشی قەدەغە کردووە و کە نا عەدالەتیان لێ دەکەوێتەوە، هەڵبەت گرینگی لێرەدا ماڵی یەکتری خواردن تەنها لەسەر ئاستی پەیوەندی تاکەکان سەیر ناکرین، بەڵگە ببینە یاسای کۆم: دەوڵەتیشە چونکە ئەگەر کۆمەڵگا و دەوڵەت لایەنی کەمی مافەکانی ئابرومەندانە بۆ هەموو کەس و خێزانێك دابین بکات ئەوا نا عەدالەتی دەکەن با ناهەقی بەشی ئەویان خواردووە، چونکە هەروەك پێغەمەبەرمان محمد (د.خ( دەفەرموێ (( خودا ئەوەندەی بەسەر دەوڵەمەندەکاندا رژاندووە بە ئەرك کە هیچ کەس هەژار نەمێنێت)) وە پێشەوا ( عەلی کوری ئەبو تالب ) دەڵێت )) لە پاڵ هەموو ماڵێکی بە ناهەق کۆکراوەدا کۆمەڵێك مافی خوراو هەن (( ، ئەرکی کۆمەڵگا و دەوڵەتە لانی کەمی ژیان بۆ هەموو کەس و هاولاَتیەك دابین بکەن. مرۆڤەکان هەموو تان دادپەروەر بن لەگەڵ یەك لە هەموو لایەك چونکە ژیان بە دادپەرەوەری خۆشە هەمیشە دادپەروەری ژیانی هەموومان دەگۆرێت بەرەو خۆشی بەرەو ژیانێکی ئاسودەیی بەرەو ژیانێکی بەختەوەری دادپەرەوەری مافی هەموو کەس دەدات وە ژینیان بەر و پێشکەوتن و خۆشی دەباتە ئەو ژیانەی خەونی پێوە دەبینین دەبێتە ژیانێکی راستی ژیانێکی خۆشبەختی هەموو مافێکی تێیدایە وە هەموو کەس پێویستە دادپەروەری بکات لە نێوان خەڵك تا بتوانێ جێی متمانە بێ تا کێشەی خەڵك چارەسەر بکات تا کێشەکانمان کەم بێتەوە

وە مرۆڤێکی دادپەروەر بێت ئەوا ماف هەموو کەس دەدات بۆیە لە ژیان پێویستمان بە مرۆڤی دادپەروەریە تا بتوانین ماف خۆمان بە دەست بێنین تا بتوانین ژیانێکی خۆشبەختانە ببەینە سەر تا زوڵمان لێ نەکرێت تا مافمان لێ نەخورێت بۆیە دادپەروەری پێویستە هەموو خەڵکێك بیزانێ تا بتوانێ داوای ماف خۆی بکات تا راستی ژیانی خۆی بزانێ تا راستی مافەکانی خۆی بزانێ کە لە هەر هەموویان گرینگتر ئەوەیە ماف تاکە کەس کە لە دادپەروەری دا دەبێ گرینگی زۆری پێ بدرێت تا مرۆڤەکان هەست بە بونیاتی خۆیان بکەن، ئەمە راستی دادپەروەریە ئەمە راستی مافەکانتانە بۆیە مرۆڤەکان هەردەم داوای ماف خۆتان بکەن چونکە دەبێ ئێمە لەسەردەمە دادپەروەری دا بژین تا مافەکانی خۆمان بزانین مرۆڤەکان ئەمە راست دادپەروەریە و ئەمە راستی ژیانە کە دەبێ بیزانن.

# ١٤- ڕاستگۆیی

زۆر جار ئەوترێت راستی یان حەقیقەت تاڵە !وە یان زۆر جار پێدە کەنین بەڵام چۆن پێکەنینیك کە وەکو ئەوەی مەست بوبێتین لە بێ ئاگایی خۆمان کاتێکیش بە بیر خۆماندا دێینەوە کە کار لە کار خەریکە دە ترازێت، بۆیە هەموو مرۆڤێك با تەمەنیشی گەورەوە بێت یان رۆشنبیرو خوێنەوار بێت پێویستی بە پەندو ئامۆژگارییە، هەرچەندە زۆرێك لە مرۆڤەکانی ئەم رۆژگارە حەزیان بە ئامۆژگاری نیە!!. راستگۆیی ژیان لە هەموو شتێك گرینگترە وە یەکێکە لە بنچینەکانی باوەر چونکە ئەگەر درۆت نەکرد ئەوە توشی شتی خراپ نابی وە کاری خراپیش ناکەی وە هەردەم بە رێگای راست دەرۆی وە هەردام ژینتان باشتر دەبێت وە ژیانێکی ئاسودەیی دەبەنە سەر بەڵام ئەگەر لە ژیانت درۆ بکەی وە ژیانێکی پر لە درۆدا دەبەیە سەر، هەول بدە هەمیشە راست بلی وە دوور بکەوە لەو کەسانەی کە درۆ دەکەن چونکە کەسەکانی کە درۆ دەکەن هەردەم لە ژیاندا ژیانێکی ناخۆش دەبەنە سەر درۆ دەکەن بۆ هاورێیەکانی وە درۆ دەکەن بۆ خێزانیان مرۆڤەکان دەبێ راستگۆ بن چونکە راستگۆ نەبن ئەوە ژیانیان هەموو دەگۆردرێ بۆ ژیانێکی پر لە ناخۆشی لەوانەیە لە کێشەیەکی بچووك بە درۆیەکانت خۆت لا بدەی بەڵام دلنیا بە کێشەکە گەورەتر دەبێ ئەی مرۆڤ چونکە ژیان دەبێت بێ درۆ بێت چوونکە درۆ لە ژیان دا ژیانت دەگۆرێ وە ژیانت لی وون دەکات هەردەم درۆ دەکەی وە خۆت بە گەورە دەزانی بە

درۆکانت جۆرە خەڵکێك هەن تا درۆ هەبێ ڕاستت بۆ ناڵێن ئەمەش لە مرۆڤایەتیان کەم دەکات وە ژیانیش تێك دەدات وە هەردەم ژیانێکی بێ ڕاستی دەبەنە سەر هەڵەن مرۆڤەکان چونکە ژیانتان لە ڕاستی دەچێت نەك درۆ هەردەم مرۆڤەکان خۆیان بە درۆکانی هەڵدەکێشن ئەمەش بچووکردنەوەی مرۆڤایەتیە وە نەمانی متمانەییە چوونکە مرۆڤی گەورە هەردەم بە ڕاستیەکانیەوە جوانە، هەروەکو (گاندی( دەڵێ: ڕاستی تاڵە بەڵام ئامانجی شیرنە، مرۆڤەکان ڕاستی بڵێن ئەگەر چی تاڵیش بێت بەڵام ئامانجەکەی شیرنە کە چی درۆیەکانتان زۆر خۆشە بۆ خەڵککە ئامانجی تاڵە مرۆڤەکان حەزیان لە ڕاستیە کەچی هەندێك کەس هەن تەنیا لەبەر ئەوەی خەڵك گوێیان بۆ ڕابگرێ درۆی بۆ دەکەن وە درۆی زۆر گەورەش کە مرۆڤەکانیش حەز بە درۆیەکانیان دەکەن ، سوقرات دەڵێ : کاتێك دێت کە مرۆڤەکان زۆر درۆ دەکەن خەڵك پێیان دەلێن ڕاست دەکەن ئەگەر بێیتە سەر ڕاستی ژیان ئەو مرۆڤانەی کە درۆ دەکەن دەبێتە هۆی کێشە، وە کێشەیەکی زۆر بۆ مرۆڤەکان هەردەم خۆیان بە درۆکانیان سەرقاڵ دەکەن و هەمیشە کێشەیی زۆر دەنێنەوە یەکتریان خۆشدەوێت بە درۆکانیان وە ئەوەی درۆ زیاتر بکات زیاتر لەوی تریان خۆشتر دەوێت کە ناتوانێ درۆ بکات کەسی ڕاستگۆ هەردەم پشتگوێ خراوە چونکە ڕاستگۆیە خەڵك لێی بێزارە چوونکە هیچ کات حەزناکەن گوێیان لە ڕاستی بێت ،بەڵام تۆ گوێیان پێ مەدە هەمیشە ڕاست بلێ هەرچەند بۆت قورس بێت، پەندێکی پێشینیانی کوردی هەیە دەلێ (ڕاست بەو بە ڕێگای شێر دا برۆ) ، کەواتە لە هیچ مەترسێ ڕاست

بەو بەکام ڕێگا دەروی برۆ، هەر ڕۆژێك دێت راستی دەردەکەویٚ وە سەردەکەوی، ئەی مرۆڤەکان بۆ لە مرۆڤە درۆزنەکان بێزار نابن بۆ هەردەم گوێی خۆتان بۆ دەکەنەوە بە درۆیە گەورەکانیان حەزتان لێیە قسەی لەگەڵ بکەن کەچی ئەویش درۆی گەورەتان بۆ دەکات مرۆڤەکان تا کەی وا دەبێت بە درۆیەکانیان هەلدەخەڵتێن، ئاخ بۆ ئەم زمانە کە مرۆڤەکان زۆر حەز لە درۆ دەکەن وە هەردەم دلی خۆیان خۆشدەکەن بە درۆکانیان ، مرۆڤەکان ئێمە وامان کردووە کە درۆ جێی راستی بگرێتەوە وە خۆمان لە چەند کەسێك نزیك دەکەینەوە کە درۆ دەکەن وە بە درۆیەکانیان کەسانی راستگۆ لە دەست دەدین، با ئەوە نەکەین خۆمان لە کەسانی درۆزن بە دوورخەین بۆ ئەوەی بە خۆیان دا بچنەوەو بێنە سەر رێی راست، گەرورەترین کێشەی مرۆڤ ئەوەیە کە باوەر بە درۆ دەکات باوەر بە راستیەکان ناکات ، جۆرە خەڵکێك هەن تەنها خۆیان بە درۆوە گرتووە هەندێك هەن تەنها درۆیان خۆشدەوێت نموونەیەك : مارك توین دەڵێت : بە مرۆڤی درۆزن مەڵیٚ بۆ درۆت کرد چونکە بە درۆیەکی تر وەڵامت دەداتەوە وات لیٚ دەکات باوەری پیٚ بکەیت مرۆڤی دۆزن لە هەموو کات هەر درۆ دەکات وە هیچ کاتێکیش لە درۆکردن راناوەستیٚ چونکە زۆربەی مرۆڤەکان باوەری پێدەکەن وە لە لای دادەنیشن ئەگەر بێت و مرۆڤەکان کەسی درۆزن پشتگویٚ بکەن ئەوە ئەو کەسە بەخۆی دادەچێتەوە کە ئەو هەڵیەکی کردووە دەبێت چاکی بکاتەوە ئەوجا لەوانەیە سەبر سەبر خۆی چاك بکاتەوە هەردەم وادەکات کە درۆ نەکات وە راستی بڵیٚ ئەمە راستیەکەی درۆزنە چونکە

خەڵك گوێی بۆ رادەگرێت وە ئەویش وادەزانێ شتەکی باشە درۆیان زیاتر بۆ دەکات ، خەڵکینە ئیتر بە درۆیەکانیان باوەر مەکەن مرۆڤە درۆزنەکان نابێ سەرکەون چونکە مرۆڤی راستی هەر ماوە هەر دامێنێ وە هەردەم دەبێت کەسە راست گۆکانمان خۆش بوێت نەك درۆزنەکان کەسی راستی بە هێزە هەردەم خۆراگرە ، مرۆڤانێك هەن هەردەم خۆیان بە گەورە دەزانن بەڵام بە درۆیە گەورەکانیانەوە وا خۆیان نیشان دەدەن کە ئەوان راست و دروستن وە هەر ئەوانیش سەردەکەون کە چی هەڵەن چونکە تا یاك مرۆڤی راستی مابێ لەسەر ئەم ژیانە هیچ کات مرۆڤی درۆزن سەرناکەوێ چونکە مرۆڤی راستی بە قسەی راست و با توانای راستی خۆی دەسەلمێنێ کە چی مرۆڤی درۆزن بە قسەی درۆ و بە توانای درۆ خۆی دەسەلمێنێ ئەمەش دەبێتە هۆی درۆزنەکان سەرناکەون چونکە هەردەم ژیانیان بەدرۆ دەبنە سەر ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ بە درۆ ژیانی دەباتە سەر ، هەندێك مرۆڤ درۆیان لێبۆتە نەخۆشی ئەگەر درۆ نەکەن ئارام نابن ، نموونەیەك لەسەر درۆ کردنی تەقلید : وەك دوکاندارێکی درۆزن رۆژێك کەسێك دەچێتە دوکانێك بۆ ئەوەی شتێك بکرێ دەپرسێ بە چەندە ئەو دەڵێ بیست هەزار ئەو دەڵێ گرانا ئەو دەڵێ بە خۆم بە هەژدەهەزارم هێنایە کە شەگردەکی هەیە کە کوری ئەوی وە وەسلەکەیشی لەلایە بە سێزدە هەزاری کریووە ئەوەیش وەکی باوکی هەمان درۆ دەکاتەوە بۆ کریارەکان تا گەورە دەبێت ، ئەوەیە کە کەسێك لە تۆ گەورەتر درۆ بکات تۆ دوبارە بکەیتەوە فێر دەبیت ، وە لە کەسێکم پرسی درۆزن لای تۆ چی

دەگەینیٚ؟؟ وتی لە کۆمەلگا دێنێتە خوارەوە چونکە درۆ شتێکی زۆر هێنا ناو کۆمەڵگە مرۆڤەکان ئەمەش بزانن درۆ دوژمنی خودایە نموونیەك کە درۆ دەبێتە هۆی کێشە : رۆژێك کەسێك دەبێتە شوان لە گوندێك رۆژێك هاوار دەکات دەڵێت گورگ هات خەڵکینە، خەلکەکە دەچیت کە هیچ شتێك رووی نەداوە شوانەکە پیٚ دەکەنیٚ دەلیٚ گالتەم کرد بۆ رۆژی دوایی هەمان شت دوبارە دەکاتەوە بۆ رۆژی سێیەم بەراستی گورگ دێت ئەو جارە هاوار دەکات کەس باوەری پێناکات دەڵێن درۆیە کەس ناچێت یارمەتی بدات بۆیە شوانەکە زیانەکی گەورە لە خۆی دا، بۆیە دەلێن مالی درۆزن کاول بوو کەس باوەری پێنەکرد، بۆیە مرۆڤ نابێت درۆ بکات، لە مرۆڤێکم پرسی وتم چارەسەر چیە کە درۆ نەمێنیٚ وتی چارەسەری نیە تەنها بە گەورە پیاوان نەبێت وە بە قسەی خۆش رازی بکەن کەنابیٚ درۆ بکات وە وتیشی ئەگەر بە رەقی مامەلەی لەگەڵی بکەیت دوبارە دەکاتەوە وە هەردەم دۆری پێیە، لە کەسێکی ترم پرسی وتم درۆ چیە؟؟ وتی بۆتە پیشەی هەندێك خەلك، ئەو کەسەی کە درۆ دەکات دەبێت زۆر مێشکی بە توانا بێت چونکە درۆ لە دوای درۆ دەکات، بچوکترین درۆ باشترین درۆیە، پێغەمبەر عیسا (ر.خ) دەفەرمویٚ :— (دزی بکەی باشترە لە درۆ بکەی) کەواتە درۆ زۆر لە وە گەورەترە کە ئێمە هەستی پێدەکەین کە دزی لە درۆ باشترە دەبێت گوناهی چەندە گەورە بێت مرۆڤەکان ئێوەش بزانن کە چەندە گەورەیە درۆ بکەی هەرواش دەبێت خۆمان بە دوور بگرین لە وەی کە درۆ بکەین، نموونەیەکی تر لەسەر درۆ و راستی: رۆژێك درۆ و راستی مەلەوانیان کرد

درۆیکە جلکی راستیەکەی برد و هەلات راستیەکەی بە روتیی بە بەجێیهێشت واتە هەمیشە راستی بە عەیبە بەڵام هەر سەردەکەوێت لە ئەنجام دا، بۆیە خەڵکەکان گوێ بۆ راستی ناگرن چونکە عەیبی تێدایە ژیانی پر لە ناخۆشی دەبنە سەر، وە کەسی درۆزن فێلبازە دیوی خەڵکەکەی بۆ خۆی رادەکێشیت بۆیە مرۆڤەکان هەردەم لەگەڵ کەسی درۆزنن چونکە درۆی زۆر بۆ دەکەن، هەردەم پشت بە راستی ببەستن چونکە درۆ شتێکی زۆر گەورەیە لە مرۆڤایەتیەکەت کەم دەکات ئێوەش خۆتان بەرز راگرن مرۆڤەکان چونکە راستی هەمیشە ئەنجامی شیرنە وە سەرکەوتووە.

# ١٥- پـــارە

لەسەر دزینی لەتە نانێك منیان برد بۆ زیندان وە نزیکەی پازدە ساڵ لەو زیندانەدا هەموو ڕۆژێك نانێکی تەواویان بەخۆرایی دەدامێ"! ژان ژاك رۆسۆ "مرۆڤەکان زۆربەی کات لە نەبوونی بێ پارەی خەم دەخۆن و دەمرن بەڵام هەندێکیان لە زۆری پارەی کە نازانن ئەم پارەیە چیلێ بکەن دەمرن چونکە خەمی پێ دەخۆن بەڵام ئێمە هەردەبێ سوپاس گوزار بین کە ئایە خودا دەمان داتێ یان نا ، ژیان پارەی هەبێ خەمە ئەگەر نەشی بێ هەر خەمە چونکە ژیان پێویستی پێیە کە بە هەردووك کات دا بروات چونکە دەبێ بزانی پارە چۆن بەکار بێنی پارەش دەبێتە هۆی کێشە چونکە بەکارهێنانی کوێرانە دەبێتە هۆی کێشە ، نمونەیەك) : ڕۆژێك 10 مرۆڤ دێنن دەیکەنە دوو بەش هەر بەشی 5 مرۆڤ ئینجا هەر بەشێك هەندێك پارەیان دەدەنێ ئەوجا بەشێکیان دەنێرن دەلێن ئەوە حەزتان لە چیە بۆ خۆتان بەو پارە بیکەن وە بەشەکەی تریش دەنێرن دەڵێن برۆن ئێوەش ئەم پارانە بکەنە خێر لە پاش ماوەیەك هەردوو بەشەکە دەگەرێنەوە سەیری ئەو بەشە دەکەن کە پارەیان دابویێ، کە بە حەزی خۆیان خەرجی بکەن تورە و دڵ ناخۆش گرژومۆن کە چی کە بەو بەشەیان کە پارەیان بکەنە خێر بە دەم پێکەنین و دڵ خۆش هاتوونەوە کە خۆشیەکی زۆر لە نێوان دلیان دایە( ئەمە راستی پارەیە پارە دەتوانێ دڵخۆشت بکات هەم دڵ ناخۆشیشت بکات چونکە پارە بە پێی چۆنیەتی بەکارهێنانی

ڕەفتار دەکات بۆیە هەردەم دەبێ ژیرانە ڕەفتار بکەین لەگەڵ پارە چونکە پارە مێشك بەکار هینانی دەوێ تا بتوانی لەگەڵی بگونجێ، هەروەها "ڤۆڵتێر" دەڵێ : ئێمەی مرۆڤ ... خاوەنی یەك ئاینین، ئەویش پارەیە... ! مرۆڤەکان تنها بیر لە پارە دەکەنەوە کە وا هەست دەکەن پارە هەموو شتێکی وان بێ زۆربەی کات لەسەر پارە مرۆڤەکان یەکتر دەکوژن وە لەبەر پارە ژیانی خۆیان بە فیدا دەکان مرۆڤەکان هێشتا ئێوە قەدری مرۆڤایەتی و ژیانتان نەزانیوە ژیان زۆر بە نرخترە لە پارە مرۆڤی ئێستا لە پیناو پارە خەم دەخوات بیر لێ دەکاتەوا من چ لەو پاریە بکەم بۆ قازانجی خۆی مرۆڤەکان ئەوەش بزانن کە خودا بۆ ئێوەی ناردووە دەبێ تنها بیر لە خۆتان نەکەن چونکە خەلکی هەژاریش هەیە مەرج نیە هەمووی بۆ خۆت بەکار بێنی چونکە بە برێك پارەی کەم دەتوانی دلی منداڵێکی هەژار خۆشکەی مرۆڤەکان ئێوەش هەست بە بونیاتی منداڵە هەژارەکان بکەن چونکە ئەوانیش مرۆڤ خاوەن هەستن و سۆزن وامەکە کە پارە تۆ بگۆرێ بەلکو وا بکە هەردەم مرۆڤەکان دوعات بۆ بکەن، چونکە هەر ئەو پاریە رۆژێکی تر دێت لێت دەپێچنەوە ئایە ئەم پارەیەت لە چیدا بەکارت هێنا تۆش لەبەرامبەر خودای گەورە راوستاوی چ وەلامێکت هەیە بۆ ئەو کات کە خۆت بە پارەکەت سەرقاڵ کردووە، ئایە چاکە و خێرت کردووە یارمەتی هەژارەکانت دا؟؟ ئەو وەلامە بۆ خۆت هەلی گرە تا ئەو رۆژە دادێ کە دەبێ وەلامی بدەینەوە بەرامبەر خودای گەورە، ئەی خەلکینە بزانن کە چۆن پارە بەکار

بێنن تا دڵی خۆتان و خەلکانی تر خۆش بکەن وە نەك پارەت هەمووی بروات بەڵام نەزانی لەکوێ خەرجت کردووە، وەك خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز فەرموییێتی:( إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ) ،واتە دەست بلاوەکان برای شەیتانەکانن، پێویستە لە سەرمان زۆر وووریا بین لە خەرج کردنی پارە دا مرۆڤەکان وووریابن ئێوە بە هێزترن لەوەی کە پارە کارتان تێدا بکات ئەوەش بزانن پارە مرۆڤ چاك ناکاتەوە مرۆڤ پارە چاك دەکات . هیچ شتێك وەك گیرفانی بەتاڵ مرۆڤ توشی سەرکێشی ناکات ! مرۆڤ کاتێك گیرفانی بەتاڵ دەبێ نازانێ چی بکات چونکە سەرکێشیەکی زۆر گەوریە بۆ مرۆڤ وە بیر دەکاتەوە من ئەو پارەیەم لە چی خەرج کرد نازانێ وە ناتوانێ بیریشی لێ بکاتەوە خەم دەخوات کاتێك دابینێ مرۆڤەکانی تر پارەیەکی زۆریان پێیە بەڵام سەیری خۆیان دەکەن هیچیان پێ نیە تەنها ناتوانن ئاوێکیش بکرن لە خۆیان تورە دەبن وبیانو لە خۆیان دەبینن وە سەیری دەورو بریان دەکان دەڵێن: خودایە بۆئەوپارەیەت بەمن نەبەخشی بۆ بەخشیتە بەو کەسانەی کە نازانن بەکار بێنن؟؟؟ ئەمەش دەبێتە جۆرێك کە سوپاس گوزەرانی لە بەشت کەس نازانێ کە ئەگەر تۆ دەوڵەمەند بای چیت دەکرد، لەوانەیە تۆ زۆر لە ئەوان خراپتر دەبووی مرۆڤەکان پێش ئەوەی قسەیەك بکەن بیر بکەنەوە چونکە بیر نەکردنەوە لە قسەکانت دەبێتە هۆی سەرێشەیەکی زۆر بۆ مرۆڤ دەبێتە هۆی هەلە کردن وە هەست بە خۆ نەکردن لە ژیان ، تا لە توانات دابێ ئیش بکە تا

دەتوانی کار بکە بۆ ئەوەی پێویستیت بە کەس نەبی دەبێ ئیش بکەی وە بزانن چۆن پارە پەیدا دەکەن ، نموونەیەك : رەنگە باسکردنی چۆنیەتی بوون بە ملیۆنێر بابەتێك بێت تا رادەیەك باسی لێوەنەکرێت، بەڵام (گرانت کاردۆن)، کە تاوەکو گەیشتووەتە تەمەنی 30 ساڵی بووەتە ملیۆنێر، ئەمەش لە کاتێکدا لە تەمەنی 21 ساڵی بووە وازی لە کۆلێژ هێناوەو قەرزدار و بێ پارە بووە، چەند ئامۆژگارییەکی گرنگی بۆ خەڵك هەیە و پێیوایە ئەگەر ئەوانیش رەچاوی ئەم خاڵانەی ئەوبکەن، ئەوا تا دەگەنە تەمەنی 30 ساڵی دەبن بە ملیۆنێر. پێشنیازەکانی ئەو ئەمانەن:

1- بەدوای پارە بکەوە لەم بارە ئابوورییەی ئەمڕۆدا ناتوانیت چاوەڕێ بکەیت بۆ ئەوەی ببیتە ملیۆنێر، بەڵکو دەبێت لە هەوڵی ئەوەدابیت ئەو پارەیەی کە بەدەستی دەهێنیت زیادی بکەیت. کاردۆن دەڵێت "سەرەتا داهاتی ساڵانەم 3 هەزار دۆلاربوو، بەڵام دوای ٩9 ساڵ داهاتی ساڵانەم گەیشتە 200 هەزار دۆلار، بۆیە پێویستە ئەو کەسەی دەیەوێت ببێتە ملیۆنێر دەبێت بە شوێن پارەبکەوێت و ئەمەش وایلێ دەکات کۆنترۆڵی داهاتەکەی بکات وە شانسی زیاتری بێتە بەردەم

2- بە دەوڵەمەندیت مەنازە بۆ ئەمەش دەڵێ "هەتاوەکو بەتەواوەتی نەبوومە ملیۆنێر نە کاژمێرێکی گرانبەهام کڕی و نە

جۆری ئۆتۆمبێلەکەمم گۆڕی، بۆیە وا باشترە بۆ ئەوەی ببیتە ملیۆنێر با بە کەسایەتییەکەت بناسرێیت نەوەکو ئەوەی کە هەتە.

3- پارە هەڵبگرە تاوەکو بیخەیتە بواری وەبەرهێنانەوە پارە هەڵمەگرە بۆ ئەوەی هەڵیبگریت با تاکە هۆکار بۆ هەلگرتنی پارە بۆ ئەوەبێت، کە دەیخەیتە بواری وەبەرهێنانەوە و پارەکەت بخەرە ناو چەند ئەکاونتێك، هەرگیز ئەو ئەکاونتانە دەستکاری مەکە تەنانەت ئەگەر هیچ بڕێك پارەشت لانەبێت، ئەمەش وادەکات هەمیشە هەنگاوی یەکەم جێبەجێبکەیت، کە زیادکردنی داهاتە، "من هەمیشە هەتاوەکو ئێستاش سالآنە دووجار بیٚ پارە دەبم بەهۆی ئەوەی دەستکاری ئەم ئەکاونتانە ناکەم.

4- پارە قەرزمەکە کە دەزانیت پارەی زیاتری لیٚ بەدەست ناهێنیت لەو جۆرە قەرزانە دووربکەوە، کە نابنە هۆی دەوڵەمەندتر بوونت. شتێك هەیە وەکو یاسایەك رەچاوی بکە ئەویش ئەوەی "خەڵکی دەوڵەمەند بەهۆی قەرزدان دەوڵەمەندتر دەبن و خەڵکی هەژاریش پارە قەرزدەکەن بۆئەوەی شتی پێبکڕن لەبەر ئەوە هەژارتریش دەبن.

5- بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ پارەبکە، کە خۆشەویستێکی بەئیرەییە بە ملیۆنان کەس حەزدەکەن ببن بە ملیۆنێر، بەلآم تەنیا ئەوانەی پارە دەکەنە ئەولەویەت ئەوانە دەبن بە خاوەن ملیۆن،

پارە وەکو کەپلێکی بە ئیرەیی وایە ئەگەر گوێت پێنەدا ئەویش گوێت پێنادات و دەچێتە لای کەسێکی دیکە کە گرنگی پێدەدات.

6- پارە خەوی نییە پارە نە دەزانێت پشوو چییە نە دەزانێت کاژێر چییە، پارە ئەو کەسانەی خۆشدەوێت، کە زۆر کاردەکەن، "ئەوکاتەی من تەمەنم ٢٦ ساڵ بوو لە شوێنێك کارم دەکرد، کە کاژمێر ٧ی ئێوارە دادەخرا، بەڵام من هەتاوەکو ١١ی ئێوارە لەسەر کارەکەم بەردەوامدەبووم، بۆیە هەرگیز هەوڵ مەدە لە هەموو کەسێکی کارەکەت بەبەختتر یان زیرەکتربیت، بەڵکو هەوڵبدە لە هەموویان زیاتر کاربکەیت.

7- هەژاری هیچ مانایەکی نییە ئەو ملیۆنێرە دەڵێ "من پێشتر هەژاربووم، ئەوەش زۆر ناخۆشبوو ئەوکاتەش ئەوەندە پارەم هەبوو، کە دەمتوانی پێی بژیم هەر ناخۆشبوو، بۆیە پێویستە ئەو بیرۆکەیە لە مێشکتان دەرکەن و هەژاری شتێکی خراپ نییە . هەرلەبەرئەوەشە، بیل گەیتس دەڵێت " ئەگەر بە هەژاری لەدایکبوو‌بێتی ئەوە هەڵەی تۆ نییە، بەڵام ئەگەر بە هەژاری بمریت ئەوا هەڵە لە تۆیە.

8- کەسێکی ملیۆنێر بکە بە پێشەنگی خۆت زۆربەمان لە خێزانی ئاستی بژێوی مامناوەند یان هەژار گەورەکراوین، بەڵام بۆ ئەوەی ببین بە ملیۆنێر نابێت بیرۆکەمان تەسکبێت ئەو چینەی تێیدا دەژین

بکەین بە سنووری خۆمان، پێویستە هەریەکەمان کەسێکی ملیۆنێر وەکو پێشەنگی خۆی سەیربکات و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوەبکات ئەو چۆن بوونەتە ملیۆنێر

9- وابکە پارەکەت ئیشە سەختەکە لەجێگای تۆ بکات گرنگترین شت لە هەنگاونان بەرەو بوون بە ملیۆنێر ئەوەیە، کە دەبێت پارەی زیاتر لە وەبەرهێنانەکەت بەدەستبهێنیت وەك لە کارەکەت. "دووەم کۆمپانیای من سەرەتا پێویستی بەوەبوو بڕی ٥٠ هەزاری بۆ خەرجبکەم دواتر ئەو کۆمپانیایە وایلێهات لەماوەی ١٠ ساڵی رابردووەوە هەموو مانگێك ٥٠ هەزاری لیَ قازانج دەکەم.

10- با ئامانجت١٠ ملیۆن دۆلاربێت نەوەك تەنیا ١ ملیۆن تاکە هەڵەی من لە بواری ئابووری ئەوەبووە، کەمن بیرکردنەوەکەم گەورە نەبوو، من ئێوە هاندەدەم ئامانجتان پارەی زۆربێت با زیاتر لە ملیۆنێك بێت . ""ئەوجا مرۆڤەکان بزانن کە چۆن دەتوانی پارە خەرج بکەی وە چۆن یارمەتی مرۆڤە هەژارەکان بدەی . ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت، بە ڕاشکاوی دەڵێم، لە سەردەمی دواتردا ، کەسانێك کە گیرفان خاڵی و بیَ پارە بن، بە نەناسراو سەیر دەکرێن....لە ئێستاوە دەڵێم خۆزگە وانەبووایە...! سەردامێك دێت کە ئەو کەسانەی کە گیرفانیان پرە بە نەناسراویش سەیر دەکرێن چونکە وا دەزانن پارە زانستێکی تایبەت بەخۆی هەیە وادەزانن ئەوەی پارەی هەبیَ هەموو زانستێکی هەیە وە بە کەسێکی گەورە

لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام لە راستیدا وانیە چونکە مرۆڤە هەژارەکانیش خاوەن زانستێکن تەنها ئەو پارەی نیە هەرئەوەندەیە جیاوازیان مرۆڤەکان ئەوەش بزانن زۆربەی زاناکان و فەیلەسوفەکان لە هەژاریەوە دەستی پێکردووە وە من هەژاریەکان لە مرۆڤەکانەوە فێربووم و چۆنیەتی ژیان بەسەر بردنیش هەر لە مرۆڤەکان فێربووم ژیانی سادەیی لە هەژارەکان فێربووم ژیان لای هەژارەکان زۆر بە نرخە بەڵام لای دەوڵەمندەکان هەمووی پارەیە بۆیە پارە ناو مێشکی خواردوون هەموویان بە خەم خۆیان دەکوژن یان توشی نەخۆشیەکی کوشندە دەبن وە قەت چاویان تێر نابی لە پارە وە ژیانیان لەوەدایە لە سەر زەوی بە خۆشی بە سەر بەرن بەڵام لە دونیایە کەی تر چی دەکەن لەوێ پارە یارمەتیت نادا تەنها پێت دەڵێن چیت لەو پارەیە کرد، بەلکو هەزابی پێ هەلدەکێشن مرۆڤکان هەردام هەست بە ئەسودایی بکان نەك پارەتان بوێ وە ئاسودایی لە دەست خودایە مرۆڤەکان . ئەوەی ئیمانی بەوەبێت کە پارە هەموو شتێك دەکات، ئەوا خۆی هەموو شتێك دەکات لە پێناو پارەدا ...! گەوراترین هەلەی مرۆڤ ئەوەیە وادەزانێ پارە هەموو شتیان بۆ دەکات بەڵام هەلەن چونکە زۆربای کات زۆر پێویست بە ژیان دەبێ ناك پارە دەتوانی بە دلی خۆت هەرچیاکت بوێ بیکری بەڵام ناتوانی خۆشی بکری کەسمان نتوانین تنها یەك دەقا تامنمان بکرین وە ئەوی زۆری هەبێ زۆر ناژی چونکە ئەو ژیانیە تنها وختێکە بۆت دادراوە پاش ئەم وختە بە ئاگە دێی پێت دەلێن ئەوە

بۆ وات کرد ئەوجا هەمووتان موحاسەبە دەکرێن کە چیتان کردوە وە خێزان توشی کێشە دەبێت لەبەر پارە ، برا برای دەکوژی لەبەر پارە ئەی مرۆڤەکان خۆتان بە چی سەرقال کردوە پارە ئەوندا ناهێنیٚ یەکتر بوکوژین وە خێزان تێك دان وە ئارامی خۆتان تێك بدان لەبەر پارە چونکە پارە بە قیماترین شتە لە روی ژیان ئەگەر ژیانت خۆش بیٚ پارەت نەوێت چونکە پارە کێشەکی زۆرت پیٚ دەدات ژیانتان دەگۆرێت وێرانتان دەکات پشتی خۆتان بە پارە نابستن چونکە پارە هەردامك و لە لەی کەسێکی ترا مرۆڤەکان تنها پشت بە خۆتان ببەستن چونکە هێزی خۆتان زۆر زیاترە لە پارە، ئەمە راستی ژیانە وە ئەمەش راستی پارەیە مرۆڤکان کە دەبیٚ بیزانن.

# ١٦ -خۆشەویستی

ووشەی خۆشەویستی دەتوانین بلێین باوترین ووشەیە لە ژیانی ڕۆژانەمان دا، کە گوێبیستی دەبین ،بەڵام کاتێك گوێمان لەم ووشەیە دەبێت یەکسەر بیرمان بۆ ئەوە دەچێت دەڵێین ئەم کەسە کەوتووتە خۆشەویستی کەسێکەوە، بەڵام لە راستیدا وانییە چونکە زۆر جۆرە خۆشەویستی هەیە بۆ نموونە خۆشەویستی بۆ) دایك و باوك، خودا، خێزان، نیشتیمان، هاورێیەتی، خەلك... ، هتد)،لێرەدا باسی ئەوە دەکەین ئایە ئەبێت ژیانی خۆت تەنها بۆ کەسێك تەرخان بکەیت؟؟، وە چۆن دەتوانی کەسێکی خۆشەویست بی لای خەلك؟؟ وە خۆشەویستیت بۆ ولاتەکەت...دژایهتی ژیان مەکە لە پێناوی کەسێکدا، کە نەتوانیٚ دژایەتی خۆ بەزل زانینی خۆی بکات لە پێناوی تۆدا، ژیانی خۆشەویستی بۆ کەسێکی تر کە زۆربەی کات ئێمەی مرۆڤ کێشەمان خۆشەویستیە چونکە بە هۆی ئەوخۆشەویستیە خۆمان تووشی هەموو کێشەیەك دەکەین چونکە عاشقی کەسەکە دەبین تۆش تەنها بیر لە ژیانی ئەو دەکەیەوە ژیانی خۆتان بە فیدای ئەو دەکەن وا هەست دەکەن ئەو هەموو شتێکی تۆیە بەڵام دوای ماوەیەك هەموو کات بیر لە ئەو دەکەنەوە وە ناتوانن لە ناو خەیالتان بیری لیٚ نەکەنەوە ئەمەش کێشەیەکی گەورەی مرۆڤە چونکە هەموو شتێك لەبیر دەکەن هەمووی بە فیدای یەك کەس دەکەن وە ژیانی خۆشیان وێران دەبیٚ، ئەو هەموو کارە تەنها بۆکەسێکە وە ژیانەکی پر لە ناخۆشی بە سەردەبا بەڵام

کەس نازانێ هەتا خودی خۆشت نازانی تاوەکو لەو کەسە دوور نەکەویتەوە ئەوکات دەزانی چ هەڵەیەکت کردووە بەراستی جێی شەرمەزاریە کە هەموو کەس لە خۆت دوور دەکەی تەنها بۆ ئەوەی دلی کەسێك بە دەست بێنی، مەرج نیە هەموو ئەوانەی ئەینوسم دەربڕینی ناخی خۆم بێت بەڵام ئەوە ئەنوسم کە بینیومەو وەپێم باشە کە باسیان بکەم...ژیانی من پڕن لەو گرێیانەی کە خۆم نەمبەستوون بەڵام ئەبێت بەتەنها هەموویان بە دەستی خۆم بکەمەوە...! هەنگاوی زۆرم نا بۆ ئەوەی ژیان بروا، بەڵام هەر دووبارەبوویەوە... ئەو عەقلەی ئێستا هەمە دوینێ هەم بووایە ئەوەی دوینێ کردم هەرگیز نەمدەکرد... بەڵام ئەگەر دوینێش ئەوەم نەکردایە ئەو عەقلەی ئێستام نەدەبوو...! کاتێك باڵندەکان لە ژیاندان مێرووله دەخـۆن بەڵام کاتێك دەمرن مێروولەکان باڵندەکان دەخـۆن... ژیــان بەو جۆرەیە هەموو شتەکان دەگۆڕێن ڕۆژێك بۆ بەهێزەکانە ڕۆژێك بۆ بێ هێزەکانە، ڕۆژێك سەردەکەویت ڕۆژێك سەرناکەویت. هەموو کەس دەتوانێت بڵێت خۆشمدەوێیت بەڵام هەموو کەس مەبەستی نیە کەواتە کاتێك هەستت پێکرد بڕوای پێبکە نەك کاتێك گوێت لێی بوو، بناغەی خۆشەویستی ڕاستگۆی و متمانەیە .

مرۆڤەکان تنها بیر لەو کەسە مەکەنەوە چونکە زۆربەی مرۆڤەکان بەڵێنی هەتا هەتایی نادەن چونکە مرۆڤەکان هەردەم هەردەم فێری یەك شت دەکەن ئەویش خۆشەویستیە بەڵام بە شێوازەکی کوێرانە کە واتە ژیانێکی مردووانە هەست بە بوونی کەس ناکەی تەنها بە ئەو کەسەیی کە خۆشتدەوێت ئەمەش ژیانت لێ ئالۆز دەکات ،هەول بدە لە ژیانت دا

کەسێکی سەربەست بی چونکە خۆشەویستی هەموو کاتەکانت لێت دەگۆرێ ژیانێکی پر لە خەموو و کێشە دەبیبە سەر چونکە خۆشەویستی وات لێدەکات کە گرنگی بە کەس نەدەی تەنها ئەو کەسە نەبێ کە خۆشتدەوێت مرۆڤەکان بەراستی خۆتان نازانن کە ئێوە توشی کێشەبونە، وە هەست بەتەنیای دەکەن وە هەمیشە مرۆڤەکان گۆری خۆیان بە خۆیان هەلدەکەنن واتە وا لەخۆیان دەکەن کە عاشق بن عاشق بوون واتە کەسێك لە مێشکدا مردوە تەنها بە دڵ زیندووە ئەم دڵەش تەنها بۆ کەسێکە، ئەمەش زۆر کات لە کۆتاییدا کارەساتی دلتەزێن روودەدات، وە دواکەوتنی مرۆڤایەتیە مرۆڤەکان تا کەی وا بەو نەزانینە بەردەوام دابن، دەی سەیرێکی دەوروبەرتان بکەن بزانن کە چی روودەدات؟؟ بوون وسۆزی خۆتان بێبەش نەکەن لە دەوروبەرتان چونکە ئێمەی مرۆڤ تەنها بۆ یەك کەس ناژین چونکە زۆر کەسی تر هەن زیاتر گرینگیان پێداوین ئەوانیش ( دایك و باوك وهاورێکانت..) و هەردەم لەگەڵتن خۆشەویستی دایك و باوك هیچ کات نابرێتەوە هەرچەند ئەوانت خۆشبوێ هەر کەمە چونکە ئەوان ئامادەن هەموو شتێك بۆ تۆ بکەن وە هەمیشە هەست بەتەنایی ناکەی وە هیچ کات بەجێت ناهێلن بەلام خۆشەویستی کەسانی تر تەنیات دەکات وە مرۆڤەکان دەبنە هۆی کۆیلەی یەکتر هەروەك چارلی چاپر دەڵێ : ئەگەر رقت لە کەسێك بوو دوعابکە عاشق بێ چونکە عاشق بوون باشترین جۆری کۆیلەیە .

مرۆڤەکان قەت بەهۆی کەسێکەوە خۆتان توشی خۆشەویستی نەکەن چونکە خۆشەویتی کێشەی مرۆڤە وە گەورترین کێشەیە، بە داخەوە لەم

سەردەمەدا خۆشەویستی پاك نەماوە تە نیا بۆ کات بەسەربردنە، خۆشەویستی وەك جەنگە کە زۆر ئاسانە دەست پێبکەین زۆریش زەحمەتە بتوانین کۆتایی پێ بەێنین . کاتێك کە خۆشەویستی دەکەی لە دەستپێکی بە چەند وشەیەك دەست پێدەکات بەڵام چەندی پێدەچێت تا کۆتای دێت لەسەر ئەم رێبازە دەست پێدەکات :١ -زۆر قسەکردن لەگەل یەکتر ٢ -هەموو نهێنیەکانی یەکتر دەزانن ٣ -هەردەم لەگەڵ یەکتر گالتە دەکەن وە خەمی یەکتر دەزانن ٤ -وە ژیانی یەکتریان خۆشدەوێت وە دوور کەوتنەوە بە هۆی چی دەبێت، بە هۆی کێشەوە کە ناحەزەکانت بۆت دروست دەکەن:

1- بە هۆی لە یەك تێنەگیشتن

٢ -خۆلەبیر کردن وە تەمەڵ بوون لە ئیشەکانت

٣ -بێهیوایی لە یەکتر مرۆڤەکان زۆرەبای کات توشی کێشەدەبن هەمووی لەبەر خۆشەویستەکەیتی وە زیاتر کێشەی خێزانی هەمووی بە هۆی خۆشەویستیە ژیانێکی پر لە سەختی دەباتە سەر وە نازانیً رێگای رزگاربوون لەم ژیانە چۆنە هەموو رێگاکانی وون کردووە، هەمیشە رێگایەك هەیە بۆ رزگاربوون لەم باردۆخە، هەروەکو چۆن حافز دەڵێ: ئەگەر ووتی عاشقێکی موخلیسی وەك ﴿حافزم﴾ناوێت بلێن کەسوڵتان هاودەمی گەدەی هەیە، حافز یەکێکە لە هەرە شاعێرە گرینگەکان کە خۆشەویستی زۆری کردووە بەڵام سەرشێتانە کردوویەتی وە خۆی لە هەموو شتێك بێبەش کردووە تەنها تا دڵی خۆشەویستەکەی بەدەست بێنی وە هەردەم لە هەولی خۆی بەردوام بوو تا بە دەستی هێنا وە لە

هەمان کات دا هەموو کێشیەکی خۆی هەبوو بەڵام هیچ کات خۆی بەدەستەوە نەداوە، وە خۆشەویستی لەلای ئەو زۆر بە بەهابوو بەڵام زۆربەی کاتیش ئازاری زۆری دەچێشت تەنها تا دلی ئەو بەدەست بێنێ وە بەردەوامیش بوو لە کارەکانی خۆی وەك شاعێرێك هەردەم خۆشەویستی خۆی لە دەست نەدەدا چونکە بەراستی خۆشەویستی حافزی وێران کردبوو وە تەنانەت سوڵتانیش عاشق ببو وە شعرەکانی حافزی زۆر دەخوێندەوە دەیزانی دەردی ئەو چۆنە وە بەراستی خۆشەویستی دەردێکی زۆر گرانە بۆ مرۆڤ یەك جار عاشق بوون واتە لەبیر کردنی هەموو کەس، هەروەکو چۆن ( مارك توین ) دەڵێ : من رقم لە عیشقە چونکە یەك جار عاشق بووم دایکم فرامۆش کرد . خۆشەویستیت بۆ کەسێك هەموو کەست لەبیر دەبات تەنانەت دایکیشت کە هەموو ئازارێکی پێوە چێشتوی بریە منیش رقم لە عاشق بوونە چونکە دەزانم زەرەری زیاترە لە قازانج هیچ قازانجێکی نیە بۆ مرۆڤ، هەروەکو چۆن "فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی" دەڵێ : مرۆڤ کە عاشق دەبێت، لەوانەیە لەبەر خاتری ئەو، منداڵکانی جێ بهێلێت . دایك و باوکی خۆی بفرۆشێت . تەنانەت وڵاتەکەیشی تووشی شەرمەزاری دەکات . ئەگەر زۆر میهرەبان بێت ، عەشق پیاوی پێ دەکوژێت و دزی پێ دەکات . ئیدی عەشق ئاوایە... عاشق بوون واتە مرۆڤێك ئامادەیە بۆ ئەو کەسەی عشقی دەبێت هەموو شتێکی بۆی بکات تەنانەت وای لێدکات دایك و باوکی بفرۆشێت ئەمە پێی دەڵێن خۆشەویستی ؟؟بەڵکو من بە بێ مێشکی دادەنێم وە تەنانەت وات لێبکات منداڵەکەشت جێبهێلی کە هەر

لە گۆشت وخوێنی خۆت بێت ئەمە کەی خۆشەویستیە ئەمە بێ مێشکیە، چونکە هەردەم منداڵەکەت داوای تۆ دەکات چۆن دڵت دێ بە جێی بهێڵی ئەمە کەی ژیانە ئەمە کەی ناوی دەنێن خۆشەویستی، مرۆڤەکان ئێوە بەرزن وە بەرزتریش دەبن خۆتان بە هێز بکەن تا بگەنە ئەو کەسەی کە دەتانەوێ، با عاشق بوون وات لێنەکات مرۆڤە بکوژیت وە دزی بکەیت چونکە ئەم دوو جۆرە کارانە بکەی تۆ مرۆڤ نیت وە لە مرۆڤایەتیش کەم دەکەیت چونکە مرۆڤ زۆر لە وە گەورەترە کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە هەموو کەسکێك لە ناخیاندا شتێکیان خۆشدەوێت بەڵام هەردام لەگەڵی نین، ئێمە نابێت بە هۆی دلەوە بریار بدەین بەلکو دەبێ بیر بکەینەوەو بە ژیرانە بریاربدەین، تۆ نابێت تەنها بیر لە خۆت بکەیت بیر بکەوە ئایە ئەو کەسە ئامادەیە لە هەموو بارێك دا لە گەلت بێ وە لەگەل خێزانەکەت دەگونجێ ؟؟ هیچ کارێك مەکە کە ناتوانی بەسەر دڵ دا زاڵبێت، هەروەکو چۆن "ئەفلاتوون" دەڵێ ئەگەر بە دڵ شتێك یا کەسێکت " خۆشویست" زۆر بە جدی مەیگرە...چونکە هیچ گرنگییەکی نییە...بەهۆی کاری خۆشویستنی دڵەوەیە...هەر وەکو چاو وایە کە کاریان بینینە...بەڵام ئەگەر ڕۆژێك کەسێکت بە " عەقلت" خۆشویست ، ئەگەر عەقلت عاشق بوو...بزانە کە شتێك ئەەزموون دەکەی کە ناوی عیشقە " مرۆڤ هەردەم بە دڵی عاشق دەبێت وە دڵی چیبوێ بۆی دەیکات بەڵام بۆ یەك جار مێشکی بەکار نایینێ تا بگاتە ئەو ئامانجەی کە دەیەوێ لە راستیدا مرۆڤ ئەگەر بە مێشك هەر شتێك بکات سەردەکەوێ وە کاتیش بە فیرۆ نادات وە خۆشەویستی هەموو شتێك لە

ژیان دەگۆرێ ئاخ ژیان بۆ وات کردووە کە هەموو ژیانمان بە یەك خۆشەویستی بگۆردرێ وە لە ژیان بێزار بن وە دەبێتە هۆی زۆر کێشە .
من رقم لەهەر شتێکە ببێتە هیۆ ئاژاوە نانەوە، من رقم لێتە ئەی خۆشەویستی چونکە دەبێتە هۆی گیان لە دەست دانی چەندین کەس وە شکاندنی دلەکان و ئازاردانی کەسەکان، ئەمەیە راستی خۆشەویستی و عاشق بوون ئەمەیە راستی ژیان .تۆ تەنها خۆشەویستی کەسێك بەدەست مەهێنە، بەلکو هەول بدە لای خەلکیش خۆشەویست بی و رێزت لێبگرن، ئێمە چۆن هەول بدەین خۆشەوەست بین لەلای خەلك لێرەدا کومەلێك خال دەخەینە بەرچاو:

٢٠-هۆکار بۆ خۆشەویست بوونت لە لای خەڵك

١ -سەرەتا تۆ سەلام لەخەڵك بکە : چونکە دڵی بەرامبەرەکەت لەئاست خۆت ئارام و دڵنیا دەکەیت

٢-دەم بە زەردەخەنەبە: زەردەخەنە دەبێتەهۆی ڕاکێشانی دڵی بەرامبەرەکەت

٣-گرنگی و ڕێز بۆ بەرامبەرەکەت دەربخە: وا هەڵس وکەوت لەگەڵ خەڵکدابکە کەخۆت پێت خۆشە بەرامبەرت بکرێت

٤ -بەشداری لەخۆشی و شادی خەڵکدا بکە

٥-ئیش و کاری خەڵك جێ بەجێ بکە: دەچیتە دڵیانەوە، چونکە خەڵکان بەلای کەسانێکدا دەچن کە کاریان بۆ جێ بەجێ دەکەن

٦ -لێبوردەبە بەرامبەر بە هەڵەکان و گیانی لێبوردەیت هەبێ

٧-لەدیارنەبوونی هاوڕێکانت پرسیاربکە: هۆکارێکە بۆ ڕاکێشانی دڵیان بۆ لای خۆت

٨ -چروك مەبە لەدیاری دا ئەگەرچی نرخەکەشی کەم بێت، چونکە دیاری بەها مەعنەویەکەی زیاترە لە بەها ماددیەکەی

٩ -خۆشەویستیی خۆت دەربخە بۆ هاوڕێکانت بە ئاشکرایی ١٠ - لێزانی بەکاربهێنە لە ئامۆژگاریەکانتدا و مەیکە بە ئاژاوە نانەوە

١١ -هەمیشە گەشبین و موژدەدەربە بۆ چواردەورەکەت

١٢ -گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکدا بکە لەو بوارەی گرنگی پێدەدەن، چونکە هەمیشە تاك حەز بەوکەسانە دەکات کە گفتوگۆی لەگەڵدادەکەن دەربارەی کارە گرنگەکانی

١٣-ستایشی خەڵك بکە ئەگەر چاکەیان لەگەڵدا کردی، چونکە ستایشکردن کاریگەری بەسەر دڵەوە هەیە بەڵام زیادەڕۆیی مەکە

١٤- خاکی بە چونکە خەڵك لە کەسی خۆ بەزلزان ڕادەکەن

١٥-خۆت بەدووربگرە لە گەڕان بەدوای عەیبی خەڵك دا، خۆت سەرقاڵ بکە بەچاك کردنی عەیبی خۆت

١٦ -هونەری بێدەنگی فێربە: چونکە خەڵك حەز لە گوێ ڕایەڵی دەکەن

17- بازنەی هاوڕێیەتیت فراوان بکە و هەر ڕۆژەی هاوڕێ یەك پەیدابکە

18- پسپۆڕیەکانت جۆراوجۆر و فراوان بکە، وەگرنگی دانەکانت وادەکەن بازنەی برادەرایەتی و ناسیاوەکانت فراوان بێت

19- ئەگەر چاکەیەکت لەگەڵ هەرکەسێك دا کرد چاوەڕوانی هاوشێوەی لێمەکەوە

20– وشەکانت جوان و پراو بکە: بەمەش ڕێزو پلەوپایەت بەرزدەبێت، ووشەی جوان باشترین هۆکارە بۆ کەمەندکێش کردنی دڵەکان بۆلای خۆت.

خۆشەویستی نیشتیمان

نیشتیمان ئەوزەوییە کە هەمیشە مرۆڤەکان لە سەری ژیاون وە باو باپیرانمان چەندین شەهیدیان داوە لە پێناویدا، بە خوێنی خۆیان بەرگریان کردووە لە نیشتیمانەکەیان، بۆ ئەوەی خۆشەویستی نیشتیمانەکەیان بپارێزن، نیشتیمان مرۆڤەکان دەکاتە چەند بوشێك وە هەموویان خاوەن کە کەلتوور و زمان و مێژووی خۆیان هەیە وە گشتیان دەیان کاتە خاوەن خەلکی خۆیان وە هەردەم نیشتیمان مافی خۆیان پێدەدات کە بتوانن لەسەر خاکەکەیان بە ئازادی و سەربەرزی بژین نیشتیمان واتە دایکی منداڵەکان خۆشەویستی نیشتمان ئەو خۆشەویستییە کە نابێ هەرگیز لە یادی بکەین وە هەمیشە نیشتیمانی خۆمان خۆشبوێت هەردەم باشترینی بدەینێ وە لە ناخماندا خۆشمان بوێت بتوانین گیانی خۆمانی بۆ فۆدا بکەین چونکە هەرنیشتیمانەکەمان دەتوانێت پارێزگاریمان لێبکات وە منداڵەکانی خۆی خۆشدەوێت دەبێت ئێمەش وەك دایکێك مامەلەی لەگەڵدا بکەین وە نەهێلین کەس پەنجەیەك بۆ نیشتیمانمان بەرز بکات وە هەردەم بۆ نیشتیمانمان کە نیشتیمانی دایکە گیانی خۆمان بۆ بەخت بکەین نەهێلین دوژمن بەسەرمان زال بێت . وە ئەمە دەبێتە هۆی پارێزگاری کردن لە نەوەی دوارۆژ، کە هەردەم سەر بەرزبن کە باب و باپیرنیان گیانی خۆیان بەخت

کردووه بۆ ئەو نیشتیمانە وه لە دوارۆژەکی گەشدا دەمێنێتەوه، هەردەم کتێبی ئەوکەسانە وه چیرۆکی ئەوکەسانە دەخوێندرێتەوە کە بە پالەوانەنا سەرکەوتن بۆ قۆناخێکی گەش ورووناك .مندالەکانیش حەز دەکەن وەك باوك و باپیرانیان بن چونکە ئەوانیش هەست دەکەن کە نیشتیمانی خۆیان خۆشبویٚ خۆیان فیدا بکەن وه وەك هەرکەسێکی ئاسایی مەبە هەردەم نیشتیمانی خۆت خۆشبوێت وه پارێزگاری لێبکە بە دڵ و بە گیان وه نیشتیمانی خۆت بە هەندێك پارە مە فرۆشە چونکە تا ئێستا تۆی پاراستوە ئێمەش تەنها دەتوانین پاداشتی بدەینەوە بە یەك شت ئەویش پارێزگاری کردنە لە نیشتیمنمان وه هەمیشە سەر بەرزبن بە نیشتینمانتان وی لە ناخەوە هەست بکەن کە نیشتینمان چەند ئێمەیان خۆشدەوێت وه لە ناخەوە پارێزگاری لێبکە وه خۆت بسەلمێنە کە تۆ نیشتیمانی خۆت چەند خۆشدەوێت وه خۆت بەرگەی هەموو ئازارێك بکە لە پێناوی نیشتیمانەکەت، هەول بدە بۆ نیشتیمانەکەت بژیت چونکە هەمیشە ئەو بۆ ئێوە باوەشی کردۆتەوە وەك چۆن دایك باوەشی خۆی بۆمندالآکانی دەکاتەوە تا هەست بە ئاسودەیی بکەن، پەندێك هەیە دەلێت) جوانە مرۆڤ لە پێناوی نیشتیمانەکەیدا بمرێت، بەلاّم لەوە جوانتر ئەوەیە کە لە پێناوی نیشتیماندا بژیت...!) با ژیانتان لە مەترسیدا دابیٚ تەنها بۆ نیشتیمانتان نا بەلکو بۆ نەوەکانتان بۆ نەوەی دوارۆژ بۆیە وامەکەن خوێنتان بە فیرۆ بروات، چونکە ئەگەر نیشتیمانی خۆتان نەپاراست ئەوا ئێوا کەستان نە پاراستوە ، دەبیٚ هەولٚ بدەین تا بتوانین سەرکەوینتا

بتوانین بژین بۆ ئەوەی بگەینە ئاوات و ئامانجمان، تەنها بە چەك ناتوانین نیشتیمانەکەمان بپارێزن بەلکو بە قەلەمەکانیشمان دەتوانین، قوتابیەخۆشەویستەکان بخوێنن بۆ ئەوەی بە قەلەمەکانتان ولاتەکەتان بەرەو پێش ببەن، شان لە شانی ولاتەکانی تر لە پێشکەوتن دابیت. بالە ناخەوە هەست بە بوونی خۆشەویستی نیشتیمانمان بکەین، ئەمە راستی خۆشەویستی نیشتیمانە، وە هەردەم تۆ لە دڵی هەموومانی نیشتیمانەکەم وە تۆمان خۆشدەوێت نیشتیمان هەر بۆ تۆ دەژین وە هەر بۆ تۆش دەمرین نیشتیمانەکەم، خۆشمدەوێی نیشتیمانەکەم تا لە ژیان دا مابم پارێزگاریت لێدەکەم تا مابم سوپاس گوزارم لە خودا کە تۆی پێبەخشیوم نیشتیمان وە سوپاست دەکەم کە تا ئێستا تۆ منت پاراستوە، وە هەردەم من خۆم بە هەموو هێزێکەوە پارێزگاری لە نیشتیمان و خاکەکەم دەکەم هەر بۆ تۆ دەژیم نشتیمانەم، ئەمە راستی ژیانە وە دەبێ خۆشەویستی نیشتینمان لە دڵی هەموو تاکێکمان دابێ وە پارێزگاری لێیبکەین وە هەردەم خۆشمان بوێی نیشتیمانەکەمان...وەك دەلێن (شام شەکرە ولات شرینترە ).بنچینەی ژیان بریتیە لە خۆشەویستی، وە بنچینەی خۆشەوەیستیش بریتیەلە خۆشەویستی بۆ خودا. خۆشەویستی بۆ خودا، دەتوانین بلێن خۆشەویستی بۆ خودا خۆشەویستیەکی تا رادەیەك جیاوازە لە وانیتر، ئەو خۆشەویستیە کە بەندە لەگەل خودای گەورە هەیەتی، هەمووما‌ن خۆشەویستیمان بۆ خودا هەیە بەڵام کەس نازانێت هی کامەمان زیاترە تەنیا خودای گەورەنەبێت، خۆشەویستیمان بۆ خودا وامان لێ دەکات

که دوربین له هه‌موو کاره خراپه‌کان، که خودای گه‌وره له قورئانی پیرۆز دا ئاماژه به هه‌موو شتێك ده‌کا که کامه شت باشه وه کامه شت خراپه بۆ مرۆڤ ، وه ئه‌و که‌سه سه که‌ووتوه که به پێ ڕێنماییه‌کانی قورئانی پیرۆز ده‌روا، بۆ ئه‌وه‌ی خۆشه‌ویست بین له‌لای خوداو خه‌لك پێویسته به راست و دروستی مامه‌له بکه‌ین، خودای گه‌وره هه‌میشه به‌نده‌کانی خۆی خۆشده‌وێت هه‌رده‌م به‌خته‌وه‌ریان ده‌کات و پال پشتیان ده‌بێت له کاتی ته‌نگانه‌دا به هانای ده‌چێت تۆ هه‌رده‌م له‌گه‌ڵ خودای خۆت به ته‌نها بیرله ئه‌و بکه‌وه چونکه زۆر به‌ی کات ئێمه که به‌نده‌ی خوداین له کاته ناخۆشه‌کان خودامان له بیره وه دوعا ده‌که‌ین خودا بۆمانی قبول ده‌کات که چی دوایی خۆشیه‌که ده‌بینی خودای خۆی له بیر ده‌کات واده‌زانێ خۆی خۆشی خۆی به ده‌ست هێناوه که‌چی هه‌میشه خودا له پشتی بووه مرۆڤه‌کان خوداتان خۆشبوێت چونکه بۆ هیچکات هه‌ڵه ناکه‌ین، چونکه ڕۆژێك دێت ده‌بێت باجی هه‌له‌کانمان بده‌ینه‌وه، وه‌له به‌رامبه‌ری خودای گه‌وره ناتوانین وه‌لام بده‌ینه‌وه ئه‌گه‌ر کاری هه‌ڵه‌مان کردبێ وه ئه‌گه‌ر خودای خۆمان خۆشبوێ له‌به‌ر ئه‌و هیچ کات هه‌ڵه‌ناکه‌ین وه هه‌رده‌م ده‌توانین ژیانی خۆمان به‌خت بکه‌ین بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و ژیانه‌ی که‌خودا بۆ ئێمه‌ی ناردوه که دابێ پارێزگاری لێبکرێت وه هه‌رده‌م کاری چاکه بلاو بکه‌ینه‌وه وه به ژیانی خۆمان فیدا بکه‌ین چونکه خودا ئاینێکی راست و دروستی پێداوین که تاوه‌کو دوور بین له هه‌موو کاره خراپه‌کان و هه‌ڵه‌نه‌که‌ین وه همیشه له‌سه‌ر ڕێگای راست دا بژین وه هه‌میشه زکری خودامان له ناو دڵ دابێ

وە بیرمان لەلای ئەو بێ چونکە هیچ شتێك نیە لە خۆشەویستی خودا مەزنترو ئازیزتربێ وە هەمیشە ژیانێکی خۆشت پێدەبەخشێ ئەگەر بێت و تۆ بەردەوام بی لەسەر ڕێگای خودا وە خۆشت بوێ، خۆشەویستی خودا زۆر گەوریە بۆ مرۆڤەکان وە هەردەم دەتوانن کاری باش بکەن وە لە ڕێگای باش برۆن وە شکست نەهێنن وە لە دوارۆژ دا پاداشت دەکرێن وە لە ڕۆژی دوایی دا بە سەر بەرزی بچنە بەهەشت، کە چی ئەوکەسانەی کە خودای خۆیان لە مێشك لە بردووە بۆ یەك ساتیش سەرکەوتوو نەبوونە وە هەردەم رق و کنەیان لە ناو دڵ هەیە وە ژیانێکی ناخۆش دەبەنە سەر وە لە ژیانێك دەژین تەنها خۆیان پێ گەورەیە هەمیشە هەڵەکان دووبارە دەکەنەوە وە سوپاس گوزار نابن لە بەرامبەر خودا وە ئەو کەسانە دواکەوتوو دەبن لە ژیانیان دا، خودا ئێمەی دروست کردووە تا سوپاس گوزار بین وە لەسەر ڕێگای ڕاست برۆین وە خودای خۆمان خۆشبوێت وە کاری هەڵە ناکەین وە لە خۆشیدا بژین کەچی ئێستا زۆربەی مرۆڤەکان ئەو شتە نازانن وە خەریکی پەیداکردنی پارە و دەسەلاتن، بەڵام بیر ناکەنەوە کە ڕۆژێك دێت دەبێ باجی ئەو کارانەمان بدەینەوە .خودا پارە و جوانی بە مرۆڤ بەخشیە بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن بە بەشیان وە یارمەتی فەقیرونەداران بدەن بەڵام بەداخەوە بە ڕێگای خودا دا نارۆن وە هەردەم پارە و جوانیەکانیان بە فیرۆ دەدەن وژیانی خۆیان لە ناخۆشی دا دەبەنە سەر چونکە لە ناخەوە دڵخۆش نین وە هەست بە ئازار دەکەن وە ئەمەش کارەساتە بۆ مرۆڤ کە نەتوانێ بە ڕێگای ڕاست و دروست

بروات کە خودا بۆی داناوە چونکە هەردەم ژیانی راستی پێویستی بە رێگای راستە وە هەردەم خودای خۆیان خۆشبوێت و داوای لێبوردن لەوبکەن، خودا لێبوردن کارانی خۆش دەویٚ، وە شوکری خودا بکەن وە خودای گەورە هەمیشە لە بەندەکانی دەبوریٚ وە رێگای لێخۆشبوونی داناوە بۆهەرکات وساتێك چونکە خودا بەندەکانی خۆی زۆر خۆشدەوێت وە هەردەم ڕێگای راستیان پیٚ نیشان دەدات وە ژیانێکی خۆشیان پیٚ دەبەخشیٚ لە ناخەوە ئەگەر بێت و سوپاس گوزاریبن بەرامبەر بە خودا هەردام خودای خۆمان خۆشبوێت تا بتوانتن بە رێگای راست برۆین وە ژیانێکی ئاسودەیە ببەینە سەر، وە دووبارە نەکردنەوەی کارە خراپەکان وە مرۆڤەکان ئێتر تێبگەن کە نابیٚ خودای خۆتان لەبیر بکەن لە هیچ کات وە لە هیچ شوێنێك، چونکە خودا زانایە بەو کارانەی کە مرۆڤ دەیکات . ئەو کەسانەی کە کاری خراپە ئەنجام دەدەن هە میشە تەماشای لای راست و چەچپان دەکەن بۆ ئەوەی کەنەیان بینیٚ، خۆزگە جارێکیان تەماشای سەرەوە بکەن. کە خودایەك لەویٚ هەیە ئاگاداری هەموو شتێکە، ئەی مرۆڤەکان هێشتا درەنگ نەبووە بگەرێنەوە بۆ لای خودا، ئێوەش هەست بە گوناهەکانتان بکەن وە هەست بە خۆشی خودا خۆش ویستن بکەن چونکە خودا هەمیشە چاوەرێی گەرانەوەی بەندەکانی دەکا بۆ لای ئەو، ئێوەشی خۆشدەوێت وە چاورێی باشترینە لە ئێوە، خودا رێگای راست پیشانی مرۆڤەکان دەدات بەڵام ئێمەی مرۆڤ بەکار ناهێنین سوێند دەخۆین بە درۆ وە خودای خۆمان لەبیر دەکەین وا هەست ناکەین کە رۆژێك دەمرین وە لێپێچینەوەمان لەگەڵ دەکریٚ،

بەس بەدوای خۆشییەکانمانین کە قسەیەکمان کرد هەست بە ناخی خەڵك ناکەین وە هەست ناکەین کە ئێمە هەلەین و بە ڕێگای هەڵە دەڕۆین ژیانێکیی پڕ سەخت دەبەینە سەر، لەو ژیانەدا هەر ئیش دەکەین بۆ ئەوەی ماڵ و سامان بە دەست بهێنین کەچی لە دوایی دا هەموو سامانەکە لە پێناو سەلامەتی ودلخۆش بوونمان خەرج دەکەین، کە چی بۆ یەك جاریش بیر ناکەینەوە کە کرنۆش بۆ خودا ببەین و داوای هاوکاری هەر لەو بکەین، چونکە هەر ئەو زاناو میهرەبانە .ئەمە راستی ژیانە وە هەر ئەمەش خۆشەویستی خودایە ، مرۆڤەکان ئیتر بەسە با واز لە شتە خراپەکان بهێنین بگەڕێینەوە بۆ لای خودا چونکە بەراستی ئەو ژیانەی ئێمە تێداین خەونە ڕۆژێك دێت هەمووومان لەو خەوە قولەهەلدەستین جا هەریەکەمان بە پیٚ کار و کردەوەکانمان پاداشت و سزا دەدرێین، بۆ خۆتان بیر بکەنەوە کە چی باشە وە چی خراپە بە ئەقلتان بریار بدەن نەك بە دڵتان چونکە پەشیمانی هیچ شتێك چارەسەر ناکات، راستی ژیانت بزانە وە ژیان بەردەوامە تا ئەو کاتەی خودا بۆ خۆمانی دەباتەوە.

# فهرست